# ڕشتەی مرواری





کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بەنرخە
لە فەلسەفە و بیر و باوەڕی کوردی

عەلائەدین سەجادی



سرشناسه : سجادي، علاءالدين، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م.
عنوان و نام پدیدآور : ڕشتەی مرواری: کۆمەڵە لەدەبییکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی/ دانراوی عەلالەددین سەجادی.
مشخصات نشر : سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹.
مشخصات ظاهری : ۸ ج.؛ ۱۴/۵×۲۱/۵ س‌م.
شابک : دوره : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠--٤١١-٨ / ج١ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠٤١٢-٥
ج٢ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠--٤١٣-٢ / ج٣ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠--٤١٤-٩
ج٤ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠--٤١٥-٦ / ج٥ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠--٤١٦-٣
ج٦ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠--٤١٧-٠ / ج٧ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠--٤١٨-٧
ج٨ : ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠--٤١٩-٤
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : کردی.
موضوع : شوخی‌ها و بذله‌گویی‌های کردی-- عراق-- قرن ۲۰م.
موضوع : ۲۰th century -- Kurdish wit and humor-- Iraq
موضوع : داستان‌های طنزآمیز کردی
موضوع : Humorous stories, Kurdish*
رده بندی کنگره : PIR۳۲۵۶
رده بندی دیویی : ۸فا۹/۲۸۲۶۲
شماره کتابشناسی ملی : ۷۴۲۸۵۳۱
وضعیت رکورد : فیپا

# ڕشتەی مرواری

-٨-

کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بە نرخە
لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی


دانراوی:

**مامۆستا عەلائەددین سەجادی**





انتشارات کردستان

سنه

# ڕشتەی مرواری

## -٨-


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕشتەی مرواری |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | مامۆستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پێداچوونەوە و هەڵەبژێری: | ژیلا قەوامی / ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٠ ـ ٢٠٢١ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٢١١ لاپەڕە (صفحەی رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابک: | دوره: ٨ ـ ٤١١ ـ ٩٨٠ ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨ ـ شابک جلد (٨): ٤ ـ ٤١٩ ـ ٩٨٠ ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨ |





سنندج، چهارراه شهدا، پاساژ عزتی، انتشارات کُردستان، تلفن: ٣٣١۶۵٣٨٢ ٠٨٧

سنە، پاساژی عیزەتی، بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ٣٣١۶۵٣٨٢ ٨٧ ٠٠٩٨

# ناواخن

ئەم کتێبە بە زمانێك نووسراوە
کە زمانی کوردییە

# بەرگی هەشتەم



انتشارات کردستان

سنه

# پێشەکی

ڕۆژ و حەفتە ئەڕوا و مانگ و ساڵ دێت. مانگ و ساڵ ئەڕوا و کارەسات یەك بە شوێن یەکدا دێت. من لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە دەستم دا بە نەخشەی «ڕشتەی مرواری»یەوە. لەم ماوەیەدا تا ئێستە حەوت بەرگی دەرچوو، ئەمە بەرگی هەشتەمیەتی کە لە بەردەستتایە. دیارە لە هەوەڵەوە گەلێ قسەشم لە سەریان خواردووە، بەڵام «بەرەکەت دا» کۆڵم نەدا. لام وایە هەموو ئیشێکی تازە سەرەتا خاوەنەکانیان کەوتوونەتە بەر پلاری پلارهاوێژان؛ ئەوانەی کە هێزی خۆڕاگرتنیان نەبووە، وازیان هێناوە و ئیشەکەیان پووکاوەتەوە. ئەوانەشیان کە خۆیان ڕاگرتووە لە ئەنجاما گەیشتوون بە ئارەزوو. ئەمە ئامۆژگارییەکە بۆ ئەو کەسانە کە ئەیانەوێ پایەدار بن لە ئیشەکانیانا.

لەسەرچوون و خۆڕاگرتن «بەر» ئەدا بە دەستەوە، ئەوانەی کە لە فرمانەکانیانا سەرکەوتوون، فرمانەکانیان زانستی بووبێ، یا پیشەسازی، وە یاسایی، بێگومان گەلێ تەنگوچەڵەمەیان هاتووەتە سەر ڕێ. وەلێ کۆڵیان هەر نەداوە تا لە ئەنجاما گەیشتوون بەو ئامانجەی کە هەیانبووە. من ناڵێم باڵۆنێکم باڵداوەتەوە بە ئاسمانەوە هێناومەتەوە، ئەمە ناڵێم، چونکە ئەو ئیشە ئیشی من نییە؛ «نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب». بەڵام ئەتوانم بڵێم: کتێبێکی وەکوو «ڕشتەی مرواری» دێنمە بەرهەم کە ئەو

جۆرە شتانە کەلەپووری نەتەوایەتی منە و بەلامەوە وایە سوودی هەیە لە ڕووی ئەدەبەوە بۆ نەتەوەکەم؛ چونکە ئەدەب بناغەی نەتەوەیە. لە هەموو نەتەوەیەکدا ـ چ کۆن چ تازە ـ دەستەیەکی تایبەتی خەریکی زیندوو کردنەوەی ئەم کەلەپوورانە بوون و بەم شتانە لەم ڕووەوە ناوبانگی نەتەوەیان بڵاو کردووەتەوە. ئەم جۆرە شتانە مێژووی بەسەرهاتی نەتەوەیە.

بەڵێ، ئەمانە لە ڕواڵەتا زاخاوی مێشکن؛ بەڵام هەریەکە دەرسێکیان تێدا هەیە و هەریەکە پەندێکی لێ وەرئەگیرێ! ئاخ خۆزگا چەرخێ لەمەو پێشتر ئێمە ئەم شتانەمان بە چاپکراوی ئەکەوتە بەر دەست، ئەو وەختە ئەمزانی کە ئێستە چ سامانێکی ئەدەبیمان هەیە.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٥٧)ەوە تا ئێستا ئاخۆ من چەند دۆستم لە دەست دەرچووبێت؟ ئاخۆ چەند لەو دۆستە دێرینانەم ـکە سەرچاوە بوون بە بەرهەمهێنانی ڕشتەی مرواری ـ لە دەست دەرچووبن و ڕوویان کردووەتەوە بۆ مەزاری خاك و منیان بە داخی کۆچی خۆیانەوە هێشتۆتەوە؟ گومانی تێدا نییە ئەو ڕێگایە ئەوان گرتیان منیش ئەیگرم و منیش ئەچم بۆ دیدەنیان. بە دیدەنییەکی هەتاهەتایی؛ بەڵام توخوا واز بێنە، بەڵکوو یەك دوو هەنگاوی‌تر بنێم، دەنگی زەنگی کاروان دەنگ ئەداتەوە؛ با هەمووومان گوێمان لێ بێ:

زڵەی زایەڵەی دووکانچەی دەماخ

ئەیداتەوە دڵ ئەکا ئاخ و داخ

ئای حاجی محەمەد عەنبەر لە کوێیت؟

خەییام بە زاتەوە لە سەدەی پێنجەم و شەشەمی هیجریدا ڕوو ئەکاتە خوا و ئەڵێ: تۆ منت هێنایە دنیاوە ئایا هیچ پرست بە من کرد؟ هاتم بۆ ئەم دنیایە بەبێ ڕەزامەندی خۆم. شێخ سەلامی شاعیری ئێمە دیوانەکەی

ئەوی کرد بە کوردی و لە ساڵی (١٩٥١)دا چاپ کرا. لەسەر ئەو شوێنە من قسەیەکم کردووە، وتوومە: وەکوو هاتنەکە پیاو بە ئارەزووی خۆی نەبووە؛ چوونەکەشی هەر بە ئارەزووی خۆی نییە. چونکە حەز ئەکا بە کەڕی و کوێری و ئیفلیجی بمێنێتەوە، هەر بەو مەرجە لە دنیا دەرنەچێت. کەچی پاڵی پێوە ئەنێن و بەبێ خواستی خۆی لە دونیا دەری ئەپەڕێنێ.

دۆستەکانی من پاڵیان پیانەوە نان و ڕۆیشتن، بەو مەرقەدەی کاکەحەمەدە پاڵ بە منیشەوە ئەنێن و ئەڕۆم؛ توخوا تا نەڕۆیشتووم با زڵیا و پڵیاوێکی تر بکەم.

ئەو ساڵە حەمەی شازەمانی ڕەحمەتی هەندێ کەوچکی «هەڵەدن»ی هێنابوو، لە بناری «مێرگەپان» بانگی ئەکرد: کەوچکی هەڵەدن ناوی قووڵە و دەسکی پان، نەخشی هەیە وەك خۆتان، بۆ ماستاوی سەردی نیوەڕوان؛ ئەحەی سابر و عەلی ماستاو دەنگ ئەکەن بە یەك بۆ پیا هەڵدان. پێیان ئەوت: تۆ لێرەوە ئەم بانگەوازە بۆ ئەکەی؟ ئەیوت: با دەنگم بگاتە ناو شار و بێن بە پیرمەوە. منیش ئەڵێم: ڕشتەی مرواری کۆرپەی گوێی ئاگردانە، ئەگەر تۆ ئەو نەدوێنی ئەو تۆ نادوێنێ.

هەموو ئەدەبێك لە هەموو سەردەمێکا و لەناو هەموو نەتەوەیەکدا چۆنیەتی پایەی ئەو نەتەوەیە دەرئەخا. هەندێك لەو ئەدەبە سەلیقەی تاکەتاکەی نەتەوەکە پیشان ئەدا، هەندێکی گوزارشت لە ڕابواردنی هەموو نەتەوەکە ئەداتەوە. بە هەردوو لایەنەوە پایەی زیرەکی و زەوقی گشت نەتەوەکە پیشان ئەدەن. نەتەوەکانی تر مایەیان زۆر بووە بۆ دروستکردنی ئەدەبەکەیان، ئەو مایەیە کە ئەوان بوویانە کوردەکە نەیبووە، لەگەڵ ئەوەشا زەوقی تاکەتاکەی وەیا هەموویان لە جموجووڵا لە دروستکردنی ئەدەبەکەیانا لام وایە کەمتر نەبووە لەوان. بۆیە وا ئەڵێم، چونکە

نەتەوەکانی‌تر نیوەی سەرچاوەی ئەدەبەکەیان لە حوکمەوە هەستاوە. کورد ئەو حوکمەی نەبووە، کەچی سەلیقە و زەوقی خۆی هەر بە زکماکی کۆگایەکی زێڕینی ئەدەبی دروست کردووە.

بە ئەندازەی توانا کەوتمە سەر کۆکردنەوەی ئەوانە و لە تۆی دوو بەرگی ڕشتەی مرواریدا خستمنە بەر دەستی تۆ؛ ئیتر تۆش کەیفی خۆتە. من بە تۆ و تۆ بە خوا. لەگەڵ ئەوەشا بۆ ئێستە کە بخوێنیتەوە ئەڵێیت: پەککوو لەوی حەلامەتەی، ئەمانەی کوو لۆ ڕێ کەتینە. عەولی عەزەی کۆنەماسیش لە وڵاتی سولەیمانی وەسپێکی ڕشتەی مرواری ناردبوو ئەڵێ:

تاقانـەی نـاو تاقانـە     دەسـتە گوڵـی دیوەخانە
قورووی دەستی نازدارانە     گوڵی دەسـتی عەودالانە

عەلائەددین سەججادی

١٩٨٢/١٢/٤



# گەنجی درەخشان

١. سالّح قازی هەبوو گێڕایەوە وتی: ئەوا زابتی لیوام لە هیندستان لەگەڵ زابتێکی زۆر گەورەی سیخ -کە هەردووکمان لە لەشکری ئینگلیزدا بووین- دۆستایەتییەکی تەواومان پەیدا کرد. زابتە سیخەکە وتی: تۆ من فێری کوردی بکە، منیش تۆ فێری ئینگلیزی ئەکەم و هەریەکیش دەفتەرێکمان هەبێ بۆ نووسینەوەی شتەکان، وتم: باشە.

دەستمان کرد بە فێر کردنی یەك. بڕیارمان وا بوو یەکەمجار وشە و پاشان ڕستە، ئەو کەلیماتی ئینگلیزی ساغی بە من ئەوت ئەمنووسی، منیش کەلیماتی کوردیم ئەوت ئەویش ئەینووسی. مەسەلەن من ئەموت: بە کوردی بە نان ئەڵێن: «پلّوو»، بە ئاو ئەڵێن: «تلّوو»، ئەیانینووسی. بە مەرحەبا ئەڵێن: «گوێت». بە بەخێرهاتن ئەڵێن: «چکوو پکوو». بە بچۆ بۆ بازاڕ ئەڵێن: «گیپ لی پیت». بە وەرە بۆ ئێرە ئەڵێن: «شنەلێ پنە». ئەمانەی هەموو ئەنووسی و وەکوو بولبوول لەبەری کردبوون. شتەکان ئێجگار زۆر بوون، ئەویش هەمووی ڕەوان کردبوو، بەڵام لەوە زۆر ئەترسام کە ئەگەر جارێك شتێکم لێ بپرسێتەوە من نازانم چیم وتووە. لەوانەیە شتی‌تر بڵێم و بە درۆ بکەومەوە، ئەوەندە هەبوو ئەو وای ڕەوان کردبوون هیچ کەڵکی نەئەکەوتە ئەوە کە لێم بپرسێتەوە.

بەم‌جۆرە تا نزیکەی سێ مانگێك ڕۆیشتین، حەمەی پوورە نازێ هەبوو، خەڵکی سولەیمانی بوو، ئەویش عەسکەری لیوا بوو، لە فەوجێکی‌تر بوو؛ نەقڵ بووبوو بۆ ئەو فەوجەی لای ئێمە. ڕۆژێك زابتە سیخەکە تووشی

ئەبێ و ئەزانێ کوردە بەو کوردیە کە فێر بووبوو، لەگەڵ حەمەدا دەست ئەکا بە قسەکردن. زۆر بە گەرموگوڕی تێی هەڵئەچێ، حەمەش بە لایەوە سەیر ئەبێ. حەمە هیندی ئەزانێ، پێی ئەڵێ: ئەوە تۆ چۆن قسە ئەکەی؟ زابتەکەش ئەڵێ: بە کوردی. ئەڵێ: باوکم ئەمە کوردی نییە. ئەڵێ: ئەی چییە؟ ئەڵێ: نازانم. منیش وا لە دوورەوە چاوم لێیانە، ئاگام لێبوو گەلێ لەگەڵ حەمەدا قسەی کرد بە هیچ دەرچوو. تێگەیشت هەر شتێك فێر بووە، هەمووی قسەی قۆڕە و هیچی هیچ نییە.

ئەوەندەم زانی شیرەکەی هەڵکیشا کەوتە ناو عەسکەرەکان وەکوو هار هەڕا ئەکا و پەلامار ئەدا، کەف ئەچەرێنێ بە ئینگلیزی و بە هیندی ئەدا بەیەکا، بە شوێنما ئەسوورێتەوە بمکوژێ. وتم: بە قورعان خوێنی خۆمم کردە تەشتەوە، وا ئەویش نزیکم بۆوە. هیچ چارم نەما چوومە چادری میجەرەکە و لە پشت ئەوەوە خۆم شاردەوە؛ ئەویش چاوی لێم بوو کە ڕووم کردە ئەوێ. هات خۆی کرد بە ناو چادرەکەدا. ئینگلیزەکان شڵەژان و گرتیان، نازانن مەسەلەیش چییە؟ پێیان وت: چییە؟ بۆ وا شێت بویت و ئەم شیرە ڕووتە چییە بە دەستتەوە؟ ئەمجا بە ئینگلیزی وتی: ئەو سەگی سەگبابە ئەمە سێ مانگە گوایە منی فێری کوردی کردووە، بە دڵ و بە گیان هەمووم نووسیوەتەوە و لەبەرم کردووە، کەچی ئێستە وەکوو تێگەیشتم هیچی بەسەر هیچەوە نییە. ئەبێ دوو ساڵ خەریك بم تا ئەوانەم لە بیر بچێتەوە. ئەم قەحبەبابە بەم جۆرە منی کوشتووە، ئێستە هەر ئەبێ پارچەپارچەی بکەم.

وتی: ئینگلیزەکان کە ئەمەیان دی، هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین و ساردیان کردەوە، منیان هێنا دەستم ماچ کرد و ئاشتیان کردینەوە؛ بەڵام دوای ئەوە ئیتر هەر بە خێستەوە سەیری ئەکردم.

٢. شێخ بابەعەلی تەکیەیی جارێك لەگەڵ مەلا حسێنی پیسکەندی و مەلا عەزیز موفتیدا ئەچن بۆ کەرکووك بۆ دیدەنی سەید ئەحمەدی خانەقا.

ئاودەسەکانی خانەقا ئەو وەختە لە دەرەوەی حەوشی خانەقاوە بوون، دیواری بەینی ئاودەسەکانیش بەرز نەبوون، هەرکەسە دابنیشتایە ئەوی تەنیشتی لێوە دیار بوو. نوێژی نیوەڕۆ ئەبێ و بابەعەلی ئەچێتە سەر ئاودەست، لەو کاتەدا یەکێکی تریش دێت لەو دیوەوە دائەنیشێت، دەست ئەبا قوتو جگەرەکەی دەردێنێ و جگەرەیەکی ئەداتێ و بەخێرهاتنی ئەکا، بە جلوبەرگەکەیا ئەزانێ بەقاڵە، دەست ئەکا بە سەودا کردنی سلّق و توور لەگەڵیا، کە ئێستە حۆقە بە چەندە، لە گەرمەی ئەو قسەدا پیاوێکی‌تر دێت ئەویش لەم تەنیشتیەوە دائەنیشێ، دەست ئەبا جگەرەیەکیش ئەدا بەو و بەخێرهاتنی ئەکا و چاك و چۆنی لەگەڵا ئەکا! ئەویش بە تۆزاوی جلوبەرگی و جامەدانەکەیا ئەزانێ تووتنچییە، خەبەری تووتنی ئاغەجەلەری لێ‌ئەپرسێ، موعامەلەی ئەوی لەگەڵ ئەکا کە باقەی جگەرە ئێستە بە چەندە! ئەمجا هەڵئەستن و هەریەکە بەلای دەستنوێژی خۆیانەوە.

ئەم خەبەرە ئەگاتەوە بە سەید ئەحمەد، سەید و ئەو دەستەیە هەر لە منالّی و فەقێیەتییەوە پێکەوە ڕەفیق بوون. سەیید کە دائەنیشن، ڕوو ئەکاتە شێخ بابەعەلی، ئەڵێ:

بابەعەلی ئەو دیوەخانە چی بوو گەرمت کردبوو؟ بابەعەلیش ئەڵێ: سەید دیوەخانە هەموو جۆرە قسەیەکی تێدا ئەکرێ، تۆ لەوێ نەبووی، لەباتی تۆ جگەرەشم دانێ و قسەشم لەگەڵ کردن بۆ ئەوەی بێ‌تاقەت نەبن! سەید ئەڵێ: بابەعەلی دەستی خۆتت وەشاند، هەر ئەو کاتە ئەمر

ئەکا ڕیـزە ئاودەستێکی ڕێکوپێـك لە حەوشـەی خانەقاکەدا دروسـت ئەکەن، تا ئەوان لەوێ ئەبن ئاودەستەکان تەواو ئەبن، ئەڵێ: بابەعەلی جوور، بابەعەلیش ئەڵێ: جووڕا و جووڕ!

٣. ئەمەیان من خۆم بەڕووەوە بووم: بەشیر مشیر لە وەختی هەڕمێنی خەیاتییەکـەی لـە بەغـدا لە هەڕمێنانە بوو. پیاوە گەورەکانی عەسکەری و مەدەنی هەموو لەلای ئەو جلوبەرگیان ئەدووری. زەمان هێنای بە سەرا هیچ ئیش و کاری نەما، هەر مایەوە سەر دووکانە ڕووتەکەی. دەردەدڵی ئەم بێ ئیش و کارییەی لە لای ساڵح قازی زۆر ئەکرد، ئەویش بەینێك خستبوویە سەر ئەوە کە ئیشێکی باشی بۆ دۆزیوەتەوە. لە ئەنجام هاتە سەر ئەوە ـ منیش لەوێ بووم ـ پێی وت: هەشت کەر لەم کەرە سپیانە بکڕە، هەموو ڕۆژێ لە «باب المعظّم»ەوە تا «باب الشّرجی» بە چەند کاروان خەڵکی سوار کە و هاتوچۆیان پێ بکە، ئەمە دەرامەتێکی باشت ئەداتێ.

بە شەرتێ ئوتۆمۆبێلیش لە جادەی ڕەشیدا زۆر بوو، بەڵام وەستا بەشیر بڕوای بە قسەکە کرد. وتی: ئاخر پارەم نییە بکڕم. ساڵح قازی وتی: کەواتە ئیشێکی باشترت بۆ ئەدۆزمەوە. زۆر بە تانوپۆی ئیشەکەدا چوو، بە تەواوی وەستا بەشیری خستە مەراقەوە، هەر ئەیوت: دە پێم بڵێ. ئەیوت: پێت ئەڵێم. زۆر لەگەڵی خەریـك بوو پێی بڵێ. لە ئەنجاما ساڵح لە سەرخۆ پێی وت: خەیاتی بکە. بەشیر تووڕە بوو وتی: ڕاسـت نەبیتەوە بۆ ئیشێ بۆت دۆزیمەوە، ئەی ئێستەچی ئەکەم؟ ساڵح وتی: مردووت مرێ هەموو ئیشێك ئەکـەی هـەر خەیاتـی نەبـێ، کتێب ئەنووسی، نووسـەر نیت؛ سیاسەت ئەکەی، سیاسی نیت؛ خوتبە ئەدەی، خەتیب نیت؛ فەلسەفە ئەنوێنی، فەیلەسووف نیت. ئەوا ئەڵێم: کاروانچییەتی بکە ئەڵێی: پارەم نییە. تۆ خەیاتیت، ئەبێ خەیاتی خۆت بکەی.

٤. بەشیر مشیر هەبوو لە بەغدا، کوڕێکی هەبوو لە بەغدا «شامل»ـی ناو بوو؛ بەڵام کە ئەیبرد بۆ کوردەواری ئەیوت «شاهۆ»ی ناوە. کچی بەگلەرێکی شەقڵاوەی بۆ مارە ئەکات. بەگەی شەقڵاوە، بەشیر بە تجارێکی گەورەی بەغدا ئەزانێ، بەشیریش بەگەکەی شەقڵاوە بە بەگی ماڵی میران ئەزانێ. ئەمانە هەریەکە بە نیازێك دەستخەڕۆی ئەو یەکەیان بووبوون.

جارێکیان بەشیر و کوڕەکەی ئەچن بۆ شەقڵاوە بۆ گواستنەوەی کچە و ئەچنە ماڵی باوکی کچە. باوکە ئەکەوێتە پەلپ و بیانوو و ڕێك ناکەون. شاهۆیش دیار بوو کچەکەی بینیبوو، تۆزێ حەزی لێ کردبوو. بەشیر ڕوو ئەکاتە کوڕەکەی ئەڵێ: هەتیو هەستە با بچینەوە هەر سێ تەڵاقی ئەو کچە کەوتبێ. کوڕەکەش واقی وڕ ئەمێنێ، ئەڵێ: بابە تەڵاقی چی؟ ئەڵێ: هەستە هەتیو با بڕۆین ئەوا هەرسێ تەڵاقم دا، بەم جۆرە ئەگەڕێنەوە بۆ بەغدا.

٥. سەمەد مەنجەڵ هەبوو خەڵکی کۆیە بوو، بەبێ پەردە قسەی ئەکرد. کاك مەسعوود محەمەد بۆی گێڕامەوە وتی:

ئەوا حافز قازی لە جۆشی بەرزی و دەست ڕۆیشتنایە لە بەغدا و یەکێکە لە شەخسیەتە دەوڵەمەندەکانی بەغدا. ڕۆژێك سەمەد بە بەر موغازەکەی حافز قازیدا تێ ئەپەڕێ تەماشا ئەکا وا حافز قازی لەگەڵ هەندێ کەسی تر لە بەر موغازەکەی خۆیا ڕاوەستاوە لەسەر جادەی ڕەشید. سەمەد لە تەنیشتیەوە خۆی ئەداتە پاڵ کۆڵەکەیەك و سەری دەردێنێ، ناسراوی پێشوویشیان لەگەڵ حافزدا نییە، بە هەموو دەنگی خۆی بانگ ئەکا: گەواد! حافز لا ئەکاتەوە. سەمەد ئەڵێ: عەمی مووناك؛ واتە: لەگەڵ تۆم نییە. حافزیش دەمی ئەبێ بە تەڵەی تەقیوە. ئیتر چی بڵێ.

٦. هەر ئەو گێڕایەوە وتی: ئەوا لە قاتی هەرە سەرەوەی ئوتێلی ترۆکادیرۆ لە بەغدا لە باڵکۆنەکەدا دانیشتبووین و سەیری ڕووباری دجلە ئەکەین، کاتیش دەمەوئێوارەیە، سەمەدمان لەگەڵایە.

ئوتێلی «لیدو»یش هەیە لە تەنیشت ترۆکادیرۆوەیە، یەك دوو شێخی عەرەب ئەوانیش لە باڵکۆنی ئوتێلەکەی خۆیان دانیشتوون و مێزیان ڕازاندۆتەوە. هەردوو باڵکۆنەکەش زۆر نزیك و بەرانبەر یەکن. هەروەکوو ئەوە وایە کە لە یەك مەجلس دانیشتبین وا بوو؛ چونکە دەنگی قسەکردنمان ئەگەیشتە یەك.

ئەوەندەمان زانی سەمەد بە دەنگی بەرز دەستی کرد بە جنێودان بە یەکێ لە عەرەبەکان. جنێو وەکوو گەڵای دار بەبێ ئەوە بیشی ناسێ. کابراش هاتە جواب و وتی: کابرا تۆ شێتی وا جنێو ئەدەیت؟ ئەم هەر لە جنێودانی خۆی نەکەوت. وتمان: کوڕە سەمەد خوا بتگرێ بۆ وا ئەکەی؟ کابرا ئێستە دێت و ئەتداتە بەر شەق. وتی: نایەت من هەر سەیرانێکە دروستی ئەکەم. وتمان: چۆن؟

وتی: ئەوپەڕی ئەوەیە ئەویش دەست بکا بە جنێودان بە من؛ چونکە ئێوە وا مەزانن ئێمە وا نزیکین و بە ئاسانی ئەگا بە من، ئەبێ لە شوێنەکەی خۆی هەستێ چل پەنجا پێپلیکانە ببڕێ تا ئەچێتە خوارەوە، ئەمجا بێتە ئوتێلەکەی ئێمە؛ چل پەنجا پێپلیکانەیتر ببڕێ تا ئەگاتە من. کابرا تاقەتی ئەمانەی نییە، ئەوا وتمان ئەم هەموو قاڵدرمانەی بڕی و هات، زانیم کە دەرکەوت، من خۆم ون ئەکەم ئەو ئەوەندەیتر تووڕە ئەبێ.

لە جنێودان بە لاوە هیچیتری بۆ نامێنێتەوە، با بۆ خۆی هەر جنێو بدا. بەڵام ئەشزانم نایەت ئەگەر بێتیش تا ئەگاتە ئێرە سارد ئەبێتەوە.

٧. خدرەسوور هەبوو لە «کەڵوێ» ئەیوت: ئاغاشرەی بانە کە لێ ئەکەون ئەبن بە ئاشەوان؛ چونکە لە ئاشەوانیشدا بڕۆ و بەردەی تێدا هەیە.

٨. کابرایەك هەبوو ناوی «برایمۆکە» و خەڵکی «کونەفلوسە»ی خۆشناو بوو. ڕۆژێك چوار بار ترێ دێنێ بۆ هەولێر. ترێکە ئەفرۆشێ و ئەگەڕێتەوە. سواری یەکێ لە گوێدرێژەکان ئەبێ و سێ‌کەی‌تری ئەداتە پێش خۆی. لەو سەروژوورەکەی لا پیرمامدا سەیر ئەکا وا سێ کەری لە پێشە. ئەڵێ: من کە هاتم بۆ هەولێر چوار بوون، ئێستە ما بوون بە سێ؟ دائەبەزێ ئەیانژمێرێتەوە سەیر ئەکا چوارن. سوار ئەبێتەوە ئەبنەوە بە سێ. ئەڵێ: دەسا شەرت بێ دەسا هەولێری‌یان کەرێکیان لێ دزیمە.

دائەبەزێتەوە ئەیانژمێرێتەوە چوارن، سوار ئەبێتەوە سێن. ئەڵێ: یاڕەبی بە گوناحم لێ نەگری هەولێرییان نەیاندزییە، ئەمە ئیشی ئەم پیرمەمەیە، پیر بووە ناتوانێ بڕوا لۆ عەجان کەر لە من ئەدزێ. ئەمە لای خۆی شێخی دووگردانە کەچی دزیش دەکا.

لەو سوار بوون و دابەزینە کابرایەکی ماوەرانی چاوی لێ ئەبێ، ئەچێ بە لایەوە پێی ئەڵێ: ئەوە لۆ وادەکەی؟ ئەڵێ: چسوانم کەرانم بردییە لۆ هەولێر چوار بوون، کەچی هەنووکە دەمێ چوارن و دەمێ سێن. ئەڵێ: ئەی ئەوەی خۆت حیساب ناکەی کە سواری بووی؟ ئەڵێ: دەك مارت بە قۆڕ نەگیرێ ئەوە کوو زانیت؟ دەسا دەبێ پێم برێی من کەینێ دەمرم، دیارە تۆ هەموو شتان دەزانی.

کابرای ماوەرانی بە لایەوە زۆر سەیر ئەبێ ئەڵێ: ئەو کەرەی سواری

بوویت هەر وەخت سێ تڕ و نیوی کەند لەم هەورازەدا تۆ دەمرێت. لێك جیا ئەبنەوە.

برایمۆکە زۆر ناڕوا پیرە نێرەکەر تڕێك ئەکەنێ. کابرا ئەڵێ: ئەوا هەندێکی چوو، تڕێکیتر و تڕێکیتر. ئەڵێ: مایەوە سەر نیوەکە، زۆر ناڕوا کەرەکە تسێك ئەکەنێ، کابرا ئەڵێ: ئەوا تەواو من مردم. لە کەر دائەبەزێ و لەو ناوەدا لێ ڕائەکشێ و کەر بەو ناوەدا بڵاو ئەبنەوە. لەلای ئێوارەدا کابرایەك بەوێدا تێئەپەڕێ، سەیر ئەکا وا زەلامێك لەوێدا کەوتووە. ئەچێتە سەری نووکە پێیەکی تێوە ئەژەنێ ئەڵێ: کابرا بۆ لێرە کەوتووی؟ ئەڵێ: لێم گەڕێ من مردیمە. ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: خدری زیندە پێی وتم: هەروەخت کەرەکەت سێ تڕ و نیوی کەند تۆ دەمری. هەنووکە ئەو کەندی و من مردم. پێی ئەڵێ: هەستە هەی کەرە، هەستە هێشتا ماوتە، هەڵیئەستێنێ، کەرەکانی بۆ کۆ ئەکاتەوە و ئەڵێ: بڕۆ لە ماڵەوە بمرە.

٩. لە سابڵاخ مەلایەکی شەرەفکەندی هەبوو دەستی دوختۆری هەبوو. ڕۆژێك کابرایەك ئەچێتە لای ئەڵێ: ئاغەی حەکیم مەلا! چاوێکم نازانم چییە، حەرارەتێکی زۆری تێکەوتووە، ئەنێڵێنی وەکوو تەنوور. لەبەر ئەوە هەم وشك هەڵگەڕاوە، هەم تەنگیش بۆتەوە. حەکیم مەلاش ئەڵێ: وەڵڵا من ئەمانە هیچی لێ نازانم، بەڵام ئەوەندە ئەزانم تۆ پیاوێکی لەخواترسیت و دوعات قەبووڵە، دوعا بکە ئەم دەردانە لە چاوی تۆ هەڵگیرێت و بیخاتە قوزی ژنی دوختۆرەوە!.

١٠. لە دێی «دڕی» کچێك لە ئەوپەڕی جوانیدا شێت بووبوو، لەبەر جوانییەکەشی لە هەموو ئەو وڵاتە (ئاڵان و سیوەیل) خەڵك هەر زۆر زۆر ئەهاتن بۆ خوازبێنی. هەر کە ناوی مێردیان لێی

ئەهێنا کچەکە ئەوەندەی‌تر شێت ئەبوو. باوك و دایکەکەشی هیچ شەخس و مەلایەك نەما نەیبەن، بە هیچ جۆرێك چار نەکرا.

ڕۆژێـك هەڵی‌ئەگرن ئەیبەن بۆلای شێخ بابەعەلی سووسە، شێخ بابەعەلی دەم و نفووسەکەی لەوانە نەبوو، هەر شێتێك بیرایەتە ئەوێ چاك ئەبووەوە. ژوورێکی تاریکی هەبوو لە ماڵەکەی خۆیا، کە شێتێکیان ئەبرد ئەیخستە ئەوێ و نەیئەهێشت کەس بچێ بەلایا. کچە شێتە یەك دوو ڕۆژ لەو ژوورەدا مایەوە، پاشان شێخ خۆی بە تەنیا چوو بۆلای و دەرگاکەی لەو دیوەوە داخست. تۆزێ بە نەرمونیانی قسەی لەگەڵ کچەکەدا کرد تا تۆزێ سامی شکا، پاشان پێی وت: کچم دەردەکەت چییە؟ ڕاستم پێ‌بڵێ، من چارەت ئەکەم.

شێخ سەیری کرد کچەکە زۆر ئاقڵە، شێخ دیسان قسەی لەگەڵ کردەوە تا بە تەواوی سامی شکا؛ ئینجا وتی: ئەوەی ڕاستی بێ یا شێخ من کچێنیم نەماوە، وە بە زۆریش وایان لێ کردووم، هەموو لەبەر ئەوەیە کە خۆمم کردووە بە شێت و کە ناوی مێردیشم لێ دێنن ئەوەندەی‌تر شێت ئەبم، ئەزانم کە پێم بزانن ئەمکوژن، ئەمەیە ڕاستییەکە، جا تۆیش ئیتر کەیفی خۆتە. شێخ تۆزێ ڕاما و لە پاشا وتی: کچم مەترسە ڕزگارت ئەکەم! ئەمەی وت و هەستا هاتە دەرەوە و دەرگاکەی لەسەر داخستەوە. [چووە لای] باوك و وتی: چوومە لای کچەکە لە پاش ئەوە دوعای جەلجەلووتی و ئەبوودوجانەم بە سەرا خوێند، چووکەچووکێك لەناو سکیەوە پەیدا بوو، کە چاك سەیرم کرد ئەمە شەیتانێکە و لەوێدایە خۆی شاردۆتەوە، وتم: مەلعوون وەرە دەرەوە ئەگینا بەم عەسایە سەر و گوێلاکت ئەنمە یەك، تەماشام کرد نایەت و زیاتر خۆی ئەشارێتەوە، دەستم دایە عەساکەم، هەر من دەستم دایە عەسا هاواری کرد: یا شێخ دێمە دەرەوە، بەڵام بەرەڵام

بکەیت، وتم: باشە مەلعوون بەرەڵات ئەکەم. ئێستا ئەو شەیتانە لە هەرکوێکیەوە بهێنمە دەرەوە ئەو شوێنە عەدەم ئەبێ، ئەگەر لە چاویەوە دەری‌کەم چاوی کوێر ئەبێ، ئەگەر لە دەمیەوە دەری‌کەم دەمی لار ئەبێ، ئەگەر لە شەرمیەوە دەری‌کەم پەردەی شەرمی ئەدڕێ، جا ئێستە ئێوە کەیفی خۆتانە لە کوێوە ئەڵێن دەری ئەکەم.

باوك و دایکی کچە وتیان: یا شێخ بەقوربانی ئەو دەم و نوفووسەت بین، نەوەڵڵا با کچەکەمان نە چاوی کوێر ببێ و نە دەمی لار ببێ، هەر لە شەرمیەوە دەری‌کە، پەردەی کچێنی نامێنێ قیر و سیا، هەموو کەس ئەزانێ کە شێخ شەیتانەکەی لە شەرمیەوە دەرکردووە لەبەر ئەوەیە کچێنی نەماوە. شێخ گەڕایەوە بۆلای کچەکە و پێی وت: ڕۆڵە من وام بۆ وتوویت، تۆیش هەر وا بڵێ کە بە دەم و نوفووسی شێخ بایەك و خوێن لە شەرمەوە دەرچوو، ئیتر ئەو جووڵە کە لە لەشما بوو نەما! دەستی گرت و هێنایە دەرەوە، باوك و دایکی دەستیان کردە ملی کچەکەیان و دەستی شێخیان ماچ کرد و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان. کچەکەش بە تەواوی چاك بۆوە و هیچ عەلەمی تێدا نەما.

۱۱. کابرایەکی جافی تەخانی سواری ماینێك ئەبێ و ئەچێ بۆلای مەحمووپاشای جاف. کە ئەگاتە بەر دەوارەکە دائەبەزێ و ماین ڕەو ئەکا و هەڵدێت. مەحمووپاشا ئەڵێ: کوڕە کاورا ئەو ماینە بۆ هەڵدێت؟ کابراش ئەڵێ: پاشا بێژم چی؟ نەگوەتییە، ئەوە چووم بۆ شار ناڵم کرد، کاورای ناڵوەنی باوەحیز خاس ناڵی نەکردووە عەزیەتی دا و ئێستە کە چاوی وە تۆ کەوت وایزانی ئەوە تۆیش ناڵوەنەکەی، وا ڕەوی کرد!.

١٢. کابرایەك «مایندۆڵی» پیرە داکێکی هەبوو زۆر دەست بڵاو بوو، بەڵام کوڕە خۆی دەوڵەمەندێکی چاك بوو. دەردە دڵی بوو لە دایکەکەی، ئەیوت: ئەمە ماڵی باوکمی هەموو لەناو دا. وتیان: کە تۆیش بمری ماڵەکەی تۆیش بەو جۆرە لەناو ئەدا. وتی: جا خۆ ئەو نابێ بە میراتگری من. وتیان: چۆن، ئەی دایکت نییە؟ وتی: نەوەڵڵا باوکم لە پێش ئەوەدا بمرێ تەڵاقی داوە!.

١٣. لە گوندێکی ئەو سەرە ژن و مێردێك شەوێ لە ژوورەوە ڕاکشابوون، سەیریان کرد یەکێ لەسەر بانەوە لە کونارِۆژنەکەوە سەیری خوارەوە ئەکا. ئەمان تێ‌گەیشتن کە ئەمە دزە هاتۆتە سەریان، چاوەڕێی ئەوە ئەکات کە ئەمانە بنوون. ئەمانە تەنانەت داریشیان لا نییە، بە دەم قسەوە ژنە بە پیاوەکەی وت: ئەرێ پیاوەکە تۆ باوکت هیچی بۆ بەجێ نەهێشتیت؟ خۆ هێشتا کاسبیەکی وات نەکردووە ئەم سەروەت و سامانەت چۆن وا پێکەوە نا؟ پیاوە وتی: وەڵڵا ژنەکە لە دزی. وتی: چۆن؟ وتی: بە شەو ئەچووم بۆ دزی، دەنگم نەئەکرد تا تۆزێ شەو درەنگ ئەبوو، مانگ هەڵئەهات. شەوقی مانگەکە لە کونارِۆژنەی ژوورەکانەوە ئەچووە خوارەوە، ئەبوو بە کۆڵەکە، دەستم پێوە ئەگرت و ئەچوومە خوارەوە! چی هەبوو نەبوو کۆم ئەکردەوە ئەمدا بە کۆڵما. دیسان بە کۆڵەکەی مانگەکەدا سەر ئەکەوتمەوە، ئیتر ئەمە ئیشم بوو هەتا ئەم سامانەم بەم‌جۆرە پێکەوەنا.

کابرای دزە لەسەر بانەوە گوێی لە قسەکانیان بوو؛ لە دڵی خۆیا وتی: ئەمە فلیمێکی باش و بێ عەزیەت و بێ ترسە. دەنگی نەکرد تا مانگەکە هەڵات، خۆی لەسەر کونارِۆژنەکە لادا، شەوقی مانگەکە چووە خوارەوە، ئەویش دەستی پێوە گرت کە بچێتە خوارەوە. ترپەی هات و کەوتە

خوارەوە. ئەستۆی ورد بوو؛ ئەمجا ژن و مێرد هەستان هاتنە وێزەی، ئەوەندەی‌تر شلوکوتیان کرد. کابراش ئەیوت: من کەوتنە خوارەوەکەم بەس نییە، ئێوەش ئەوەندەی‌تر شلوکوتتان کردم. بە پاشەڵێکی باشەوە ئەگەڕێمەوە دواوە.

١٤. مەلا ئەوڕەحمانی پێنجوێن، ئەو عالمە بەناوبانگە بوو کە یەکێك لە فەقێکانی مەلا حسێنی پیسکەندی سولەیمانی بوو. مەلا ئەوڕەحمان وەکوو ئەو عالمە بەرزە بوو، جارجار شیعریشی ئەوت. کابرایەکی یۆسۆجانی لێ پەیدا بووبوو چکێکی خوێندبوو، ئەیوت: ئەمە هەر ئێژن مەلا ئەوڕەحمان مەلایە و شاعیر، کەی وایە؟ من لەو مەلاتر و شاعیرترم. وتیان: ئەگەر وایە تۆیش شتێك بڵێ. وتی:

**مەلاوڕەحمان، مەلاوڕەحمان، مەلاوڕەخمانی پێنجوێن ڕا**

**زەڕ بەر سەر فولاد نەهی نەرم شەوەد ڕا**

وتیان تەواو شاعیری لەمە چاکتر چۆن ئەبێ؟

١٥. مەلا حەسەنی شاتری گێڕایەوە وتی: لە «مەستەکان»ـی لای ئێمە پیاوێکی موبارەکی ڕیش‌سپی هەبوو، خزممان بوو، لالە حەمەمان پێ ئەوت. ڕۆژێك لە مزگەوتەکەدا لالەحەمە نوێژی ئەکرد، خەڵکەکەش لەم‌لاوە دانیشتبوون و لە بەین خۆیانا قسەیان هاتە سەر لالەحەمە کە پیاوێکی لەخواترس و نوێژکەرە. لالەحەمەش ئەوا گوێی لێیە، هەر نوێژەکەی بڕی و وتی: بە ڕۆژوویشم! «دَلائِلُ الخَیرات»یش ئەخوێنم!. وتی: هەڵچووەوە لە نوێژەکە.

١٦. کابرایەکی «سونگر»ی مانگی موحەڕەم بوو، شین و شەپۆڕ بۆ ئیمامی حوسەین ئەکرا، ئەو کابرایە لە هەموو کەس زیاتر لە

خۆی ئەدا و ناوی عەلی و حوسێنی ئەهێنا. پێیان وت: تۆ عەلی ئەناسی؟ وتی: ڕا نەناسم. وتیان: چەندەم خەلیفە بوو؟ وتی: من یانە نەزانم، ئەوە ئەزانم کە ئیمام هوسەین ئەوی لەو دەشت کەروەلایە شەهید کرد!.

١٧. شێخ محەمەدی بەرزنجی لە مزگەوتەکەی خۆیا وەعزی دائەدا، لە وەعزەکەیا وتی: کتێب ئەفەرموێ: هەرکەسە ڕۆژی عەرەفە بەڕۆژوو ببێ وەکوو ئەوە وایە کە ساڵێك بەڕۆژوو بووبێ. ئەحەی جاو لە کۆڕی وەعزەکەدا بوو، دەنگی نەکرد تا ڕۆژی عەرەفە هات، ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بوو تا نیوەڕۆ؛ پاشان شکاندی. پێیان وت: خاڵەحمەد ئەمە چۆن ئەبێ؟ وتی: من تا نیوەڕۆ بەڕۆژوو بووم، بە شەش مانگ ئەشێ، لەوە زیاترم ناوێ!.

١٨. هەر ئەم ئەحەی جاوە، ساڵێك لە ڕۆژی دووەمی ڕەمەزانا وتی: باش بوو ڕەمەزانمان گرت و لە کۆڵمان بۆوە. وتیان: چۆن شتی وا ئەبێ، خاڵەحمەد ئیمڕۆ دووی ڕەمەزانە؟ وتی: مردووتان مرێ ئێوە نایزانن، ئێمە سی کەس لە دەستەکەی خۆمان کۆ بووینەوە دوێنێ هەموومان بەڕۆژوو بووین. ڕەمەزانیش سی ڕۆژە، ئەوە سی ڕۆژەکەمان تەواو کرد!.

١٩. کابرایەکی ئەو ناو «شوان»ـە لە قنگی شێخ و مەلادا گەورە بووبوو، ناوی سوورەتەکانی قورئانی هەموو ئەزانی. شەوێك چەند بارێ خەڵووزی بردبوو بۆ کەرکووك بۆ فرۆشتن. دەمەوبەیان ئەگاتە کەرکووك. بە بەر مزگەوتەکەی مەلا ناسیحدا تێئەپەڕێ، لا ئەدا بۆ نوێژ کردن. مەلا ناسیح خۆی پێشنوێژییەکەی ئەکرد، سوورەتی «البقرە»ی لە نوێژەکەدا خوێند، تا لێ بووەوە هەتاو کەوت و بازاڕی هەڕمێنی خەڵووز

فرۆشتن نەما. پاش نوێژ لە مزگەوت دەرچوو، بە هەرحاڵ جۆرك و خەڵووزەکەی فرۆشت و هەندێ ئیش و کاری ناو شاری هەبوو تا جێبەجێی کرد ڕۆژ درەنگ بوو، فریای گەڕانەوە نەکەوت. وتی: تازە ناگەمەوە ماڵ، ئیمشەو لە کەرکووك ئەمێنمەوە لەو سەرەوە زوو هەڵئەستم و ئەڕۆم. ئەو شەوە مایەوە، بەیانی زوو ولاغی دایە پێش و ڕۆیشت. ڕێگاکەی هەر بە بەر مزگەوتەکەی مەلا ناسیحدا بوو، وتی: با یەکجار نوێژەکەشم بکەم، مەلا ناسیح ئەمجارە سوورەتی «الفیل»ـی خوێند. کابرا کە گوێی لە «الفیل» بوو، نوێژی بڕی و کردی بە پێڵاوەکانیا و بۆی دەرپەڕی وتی: مەلا بۆچی من نازانم «بەقەر» بە مەعنای «گا»یە و «فیل»یش فیلە. دوێنێ سوورەی گات خوێند هەموو ئیشێکت لە دەست دەرکردم، ئیمڕۆ فیل ئەخوێنی، فیل دە ئەوەندەی گا ئەبێ، تا بانگی خەوتنان ناگەمەوە ماڵەوە. گوو بە ڕیشی باوك ئەو کەسە لە پشت سەرتەوە نوێژ ئەکا!.

٤٠. مەلا یووسفی تەنگیسەر جارێك لەگەڵ شێخ محەمەدی گوڵانیدا لە سولەیمانی قسەیان ئەگیرێتە یەك. قسەکەشی لەسەر ئەوە ئەبێ کە شێخ محەمەد لە باسی نەتەوایەتییەوە قسە ئەکا و زۆر بە سۆز تێ‌هەڵئەچێ. ئەو سەردەمەش باسی نەتەوایەتی لەناو هەموو جێگایەکدا ئەوەندە باوی نەبوو. مەلا یووسف پێ ئەڵێ: کافر بوویت و دان بەوەدا بنێ کە تۆ لە دین دەرچوویت. شێخ محەمەدیش ئەڵێ: مەلا یووسف دان بە کوفری خۆما نانێم، تەنیا بۆ ئەوە نەبێ کە بەربەرەکانی ئەو کەسانە ئەکەم کە لایان وایە کە خوا تۆی لەسەر جوانترین سوورەت دروست کردووە ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ ئەمە لە تۆدا نەهاتووەتە دی. ڕەنگبێ بەمە کافر ببم.

٤١. کابرایەکی «باوەجانی» چووبوو بۆ حەج، پاشان لەگەڵ کاروانا چوو بۆ مەدینە. سەیری کرد وا حاجییەکان هەموو لە دەوری بارەگای پێغەمبەرا خێر و خێرات ئەکەن؛ ئەویش هەرچێکی هێنابوو بۆ حەج هەمووی لە کەعبەدا بڵاو کردبووەوە، هیچی پێ نەمابوو بۆ مەدینە. ئەمجارە بە دەورەی گومبەزی پێغەمبەرا ئەسووڕایەوە و ئەیوت: «لالەحەمە» بیم وە ساقەت! ئەو کاوراکانی «کاوە» هیچیان پێ نەهێشتم بۆت بێرم، ئەوە لە ڕێگای تۆدا هەر سێ تەڵاقی خازەی کارەکەرتم دا!. (خازە: ژنی بوو).

٤٢. ئەحەی کڕنوو هەبوو لە سولەیمانی، خانوویەکی هەبوو فرۆشتبووی؛ کەچی هەموو جار هەر ئەچووە ئەوێ، ئەوانیش دەریان ئەکرد. چەند جارێك شتی وا ڕووی دا لە ئاخرا وتی: من لەم خانووەدا هاتوومەتە دونیاوە لە بیرم ناچێتەوە؛ خەریك بوو لە بیرم بچێتەوە کەچی دایکە ڕەحمەتییەکەم هاتە خەوم و پێی وتم: ڕۆڵە شیرەکەم پێت حەرامت بێ ئەگەر خانووەکەمان بەجێ بێڵیت.

٤٣. دوو کابرای «سیان» ئەبن بە هاوڕێ و ئەچن بۆ هەولێر. لە ڕێگادا هەروا دەست ئەکەن بە قسەکردن بۆ ئەوە ڕێگاکە بە قسە ببڕن. یەکێکیان ئەڵێ: ئێستە لەم ڕێگایەدا کووپەڵەیەك لیرە ئەدۆزینەوە بەشی ئەکەین لە بەینی خۆمانا. من بەشەکەی خۆم ئەچم ڕانەمەڕێکی پێ ئەکرم، پێوە بە تەواوی ئەحەسێمەوە. ئەوی‌کەشیان ئەڵێ: دەسا من بە بەشەکەی خۆم چەند گورگێك پەیدا ئەکەم بکەونە ناو مێگەلەکەت بیانخۆن، توڵەباب کوو مەڕ ڕائەگرێ؟ لەسەر ئەمە ئەبێ بە شەڕیان و سەروگوێلاکی یەك ئەنێنە یەك.

لەو کاتەدا سەیر ئەکەن وا پیاوێکی ڕیش سپی لە ڕێگای خۆشناوانە سواری کەرێك بووە و جەوەنەیەکی لە بەردەمایە، هات. وتیان: با ئەو پیاوە شەرعمان بکات، بزانین کاممان لەسەر حەقین. کەر سواریان ڕاگرت و کێشەکەی خۆیانیان بۆ گێڕایەوە. ئەویش تووڕە بوو، هەر دەستی برد پشکی جەوەنەی کردەوە دۆشاوی تێدا بوو، دۆشاوی بەو ناوەدا هەڵڕێشت و وتی: خودا خینم وەکی وی دۆشاوەی لەسەر وی عەردەی بریژیێ، چ بران هەقرتان نینە و شێتن!.

٢٤. شێخ بابەعەلی تەکیەیی و مەلا عەولای پەسۆیی کتێبی «خلاصة الحساب» لەلای مەلا عومەر ئەفەندی هەولێر ئەخوێننەوە. بابەعەلی بە مەلا عەولا ئەڵێ: من تاقەتی بەرێ، بەرێ و هەنووکە، هەنووکەی مەلا عومەر ئەفەندیم نییە و لێی تێ ناگەم. پێکەوە ئەچین لە کۆڕی دەرسەکە دائەنیشین، تۆ بە پوختی وەری بگرە و پاشان بە منی ڕەوان کە.

مەلا عەولا ئەڵێ: بابەعەلی شتی وا چۆن ئەبێ؟ بابەعەلی ئەڵێ: بەگوێم ئەکەی باشە، بە گوێم ناکەی بەو دارە سەروبەچکت ئەنێمە یەك. ناچار مەلا عەولا ڕازی ئەبێ. لە پاش تەواو کردنی کتێبەکە بە جووتە پێکەوە ئەچن بۆ «بیارە» بۆلای مەلا قادری بیارە. لە بیارە مەلا نەبی ناوێکی خەڵکی ئەو باڵەکایەتیەی لێ ئەبێ، کە ئەویش هەر بۆ ئەوە چووە کە لەلای مەلا قادر بخوێنێ.

ئەم مەلا نەبییە پیاوێکی زیرەك و لەگەڵ زیرەکییەکەشیا تۆزێ بێ ئەقڵی هەبوو. هەر فەقێیەك بچوایە بۆ بیارە لەگەڵ ئەگەیشتە ئەوێ بەبێ ئەوە چاو بکاتەوە مەلا نەبی بە پرسیار لێ کردن دایئەگرت و ئەیشڵەژاند، وای لێ ئەکرد کە بە تەواوی بۆ لەوەبەدوا چاوترسێن ئەبوو!.

بابەعەلی و مەلا عەولا، ناوی ئەم مەلا نەبییەیان بیستبوو کەوایە. ئەگەنە نزیکی بیارە مەلا عەولا ئەڵێ: بابەعەلی ئێستە ئێمە ئەچین و مەلا نەبی بە پرسیار دامانئەگرێ، لەوانەیە نەیزانین، بە تەواوی حەیامان ئەچێ. بابەعەلی ئەڵێ: مەلا عەولا ئەمە لێگەڕێ بۆ من، من عیلاجی ئەکەم. ئەچن و ئەگەنە جێ. مەلا نەبی و فەقێکانیتر دێن بە پێشوازیانەوە. خەڵکێکیتری زۆر کۆ ئەبنەوە. بابەعەلی بەبێ ئەوە بێڵێ مەلا نەبی بێتە زمان ئەڵێ: مەلا نەبی پرسیارێکی «فَرائِض»: «پیاوێك مرد، ژنێك و کچێك و کەرێکی لە شوێن بەجێ ما؛ چۆن میراتەکەیان بۆ بەش ئەکەی؟» مەلا نەبی ئەڵێ: ژنەکە هەشتیەك ئەبا، کچەکە نیوەی ماڵەکە ئەبا و ئەوەستێ، هەرچەندە فیکر ئەکاتەوە هیچیتری بۆ نایە، لە پاشا ئەڵێ ئەوە ئەوان دیارن، بەڵام شەرعی شەریف بۆ ئەم کەرە نایەتە خەیاڵم ئێستە کە هیچی دانابێ. ئەم مەسەلەیە من نایزانم، دواجار سەیری ئەنواری مەزنی بۆ ئەکەم. ئیتر ببڕای ببڕای مەلا نەبی نەیوێرا جارێکیتر لە عاستی ئەوان بێتە زمان. بەڵکوو ئەو چاوترسێنی ئەوان بوو. ئەوانیش پاش ماوەیەك خوێندن لە بیارە ئەگەڕێنەوە بۆ هەولێر، ئیجازە لە مەلا عومەر ئەفەندی وەرئەگرن.

٢٥. شێخ ڕەزای تاڵەبانی بۆ شاعێری ناوی لە هەموو لایەك دەرکردبوو. گەلێ جار شاعیرانی ئەو سەردەمە شیعریان دائەنا، بۆیان ئەبرد بۆ ئەوە ئەو پەسندی لە سەر بنووسێ. ئەویش ئەو شتانەی کە بەدڵی نەبوایە یەك شیعری دانا بوو بۆی لەسەر ئەنووسین؛ وەکوو لەگەڵ شاعیرێکی قزڵجەیشا ئەمەی کردبوو.

یەکێك هەبوو لە وڵاتی کۆیە مەلا تەماتەیان پێ ئەوت. هەندێ

شیعری دانابوو، بردبووی بۆ شێخ ڕەزا پەسندی بۆ لەسەر بنووسێ. کابراش ناوی شیعری نابوو «رەعد»؛ شیعرەکانیش ئەمانە بوون.

شـاعری بلّنـد هـەر دوو ولایـەت
خـوا بتهێلـێ بـۆ فەیـز و کەرامـەت
یاخـوا بەخێـر بیـت بـۆ وڵاتـی کۆیە
دایـم بـە خزمەتـان وەك من بـۆ تۆیە
تۆ شێخ ڕەزایت و تەخەلوسی من ڕەعد
بـا بیزانـی من شـاعیرێکی پـڕ ئاوازم
ئێمە شـاعیر بوویـن لە بـاوك و باپیر
دوعا گۆی شـیعرین شـاعیری ئیعزازم
ناومـان لـە دونیـا وەك نـاوی تۆیـە
زەمانێك بوو بۆ دیـدارت ئاوات خوازم
تەقدیمتان ئەکەم ئـەم غەزەلە جوانەم
«تقریظ»ـی بفەرموون بۆ سـەرفرازیم
ئومێـدەوارم بـە لـوتفی بـاری
بـۆ مـن دایـم مەعدەنـی ڕازم

ئەمە ئەینووسێ و ئەینێرێ بۆ شێخ ڕەزا. شێخ ڕەزایش بەم شیعرەی خوارەوە پەسندی ئەکا و بۆی ئەنێرێتەوە.

ئەی تڕت ڕەعد و تست ڕەشەبا «هكـذا إرثكـم جـدّاً و أبـا»

٢٦. شێخ «عبدالحمید»ی ئەتروشی بۆی گێڕامەوە وتی: شێخ نوور محەمەدی بریفکانی پیاوێکی بەدیمەن و ناودار بوو. کە ئەهاتە مووسڵ خانوویەکی سەربەخۆی خۆیی هەبوو لەوێ ئەبوو. پیاوە گەورەکانی

مووسڵ هەموو ئەهاتن بۆ دیدەنی. دیوەخانی هەموو دەم گەرم بوو.

مام تەهایەکی قسەخۆش هەبوو موختاری یەکێ لە گوندەکانی ئەترافی مووسڵ بوو. ڕۆژێك ئەویش دێ بۆ دیدەنی شێخ. ئەو دائەنیشێ، بەرەبەرە مووسڵیەکانیش دێن، هەر مووسڵیەك دێت شێخ پێ ئەڵێ: «فەوق». هەر فەوقێك ئەکرێ مام تەها تۆزێك ئەخشێتە خوارەوە تا ئەکەوێتە لای دەرگاکە. جارێکی شێخ چاك و چوونی لەگەڵ ئەکا ئەڵێ: مام تەها چەڤەنی؟ مام تەهایش ئەڵێ: ئەزبەنی چەڤەنم «فەوق»ێکی‌تر بکەی ئەز لە دەرێمە!. شێخ نوور محەمەد دەست ئەکا بە پێکەنین ئەڵێ: مام تەها ئەمانە بە میڤانی هاتینە دەبێ بیانڕێزێنین. مام تەهاش ئەڵێ: ئەزبەنی وەکوو بزانی ئەز قوزلقورتم!.

٢٧. مەلا حەسەنی شاتری بۆی گێڕامەوە وتی: لالە مارفێکی خزممان هەبوو دەروێشی شێخی کربچنەش بوو. پیاوێکی پیر بوو. من تازە خەتم دابوو، لالە مارف فرە شوێن گەڕا بوو: سنە و سولەیمانی و بانە چووبوو. کە خێڵ ئەچوو بۆ کوێستان بە تەنیا بە گۆشەی هەورامانا ئەچوو بۆ مەریوان و شلێر و ناوخوان. وەکوو بڵێیت دێوانەیەکی هەبوو.

ئەو سەردەمە شارەزوور وەکوو ئێستا نەبوو، بە دەگمەن ماڵە جافی تێدا هەبوو. ئەو دەشتی شارەزوورە هەموو گژوگیا و قامیشەڵان بوو. وتی: من تازە پێ ئەگەیشتم، جارێك لەگەڵ لالە مارفا چووین بۆ هەڵەبجە. مامۆستا شێخ ڕەسووڵ زۆر نەبوو، بووبووە مەلای مزگەوتی پاشا، وەعزی ئەدا ئێمەش چووینە وەعزەکەیەوە. ئێستەش لەبیرمە مامۆستا شێخ ڕەسووڵ لە وەعزەکەدا وتی: خوانتەعالا کە ویستی ئادەم دروست بکا، جبرائیلی نارد مستێ خۆڵی لە «دەجنا»ی لای تایفەوە برد و بە تۆزێ لە

ئاوی «تایف» کردیان بە قوڕ و ئادەمی لەو قوڕە دروست کرد. مەلا حەسەن وتی: هەر ئەوەندەم زانی لالە مارف ڕاست بووەوە و وتی: ئەرێ مەلا ئەوە تۆ ئێژی چی؟ وەلای خۆتەوە عومرت کردگە! بۆچی نایێژی: بینایی چاوان جورەیلی نارد مشتێ خۆڵی لە گوێچکەی سەیساق هەڵگرت و قمێ ئاوی لە ئاوە جوانەکەی سەراوی سوبحاناغا بۆ برد؟ ئەگەر وەوەش ڕازی ناوی لە کانیاوەکەی «حەوشوبارانی» بۆ برد، وە دەسی موبارەکی شێلای، دواجار پفێکی پیا کرد باوکە ئادەم دروست بوو. چیت داگە لەم دەجاج و مەجاجە؟ توخوا مەلا تا ئاوی سەراوی سوبحاناغا و حەوشوبارانی بوێسێ، بینایی چاوان ئەچێ لە ئاوە بێفەڕەکەی ئەو خوارە تێرێ؟ هیچ نەوێ خۆ تۆ خوێندگتە تا ئەو خۆڵە موارەکەی سەیساق هەوێ پیاوێ هەقڵی بوێ ئەچێ وەلای شتیترەوە؟ تەماشاکە ئەم دەشتی شارەزوورە خوا نەیورێ ئێژی هۆڕی ماڵە گەورەس گوڵ گوڵ بووگەسەوە، ئەوە گشتی هی ئەو ئاوە جوانەس کە وە سەریا لرفە ئەکا، تەواشاکە ئە شۆڕە سواری تەرخانی و ڕوغزایی و شاترییە کە ئێژی مەلایکەی سەر عەرزن، ئەگەر هی ئەو ئاو و خۆڵە نەون چۆن کوڕە کوڕی وایان تیا هەڵئەکەوێ؟ بچۆرە ئەو دەشتی کەماجەڕ و حەوشوبارانییە لەبەر بۆنی عەتر و عەویر، ئێژی بەهەشت لە وێنەی کەوتگەسە خوارەوە. کە بینایی چاوان ئاو و خۆڵی وای لە بەردەسا هەوێ، چۆن ئێژێ وە جورەیل بچۆ لەو خوارەوە ئاو و خۆڵم بۆ بێرە؟ وە قەورەکەی حەمەپاشا خواوێت و قسەی وا ناکا. ئەوە نازانم جورائیل دزی لێ کردوێ. تۆ وێژی خوا ئەوەندە بێئاگا وێ بڕوا ناکەم؛ با ئیش و کاریشی فرە وێ ئاگای لەوە هەر ئەوێ. خۆ خەوی لێ نەکەوتگە! جا مەلا ئەوا پێت یێژم، وەو کەریمە سوورەی کەسنەزانە جارێکیتر وەعزی وا بدەی وەم گالۆکە سەر و بەچکت ئەنێمە یەك!.

٢٨. قاراغای قارەوا پیاوێکی هەبوو «بایز»ی ناو بوو، ناردی بۆ شار هەندێ شتومەکی بۆ بکڕێ، پێشی وت: ئەگەر تانجییەکی ڕەسەنیشت بەرچاو کەوت، بە هەر پارەیەك بووە بەڵکوو لە خاوەنەکەی وەربگری و بیهێنی.

بایز چوو شتەکانی هێنا، بەڵام تانجییەکی وای بەرچاو نەکەوت گەڕایەوە. قاراغا کە زانی تانجی نەهێناوە زۆر تووڕە بوو. بایز وتی: ئاغا ئەم تووڕەییەی پێ ناوێ، بەڵکوو من نازانم تانجی چۆنە! ئاغا وتی: کەس هەیە نەزانێ تانجی چۆنە، تانجی گوێکانی درێژە، کلك و ناوقەدی باریکە. بایز وتی: جا ئاغا ئەمە ئاسانە. من ئەچم ئێستە هەر لە قارەوادا سەگێك دێنمە ئەم ماڵە. قسەت ئەدەمێ هەر بە یەك حەفتە لە برسانا گوێی شۆڕ بێتەوە کلك و ناوقەدی وا باریك بێتەوە بە کونی سووژنەوە فرتە بکات!.

٢٩. کابرایەك هەبوو لە سولەیمانی «عەلی یوزباشی»ـیان پێ ئەوت، خەڵکی ئەو خوارە و تەقاویت کرابوو. هاتبووە سولەیمانی ژنێکی هێنابوو، لە گەڕەکی قەزازەکان دانیشتبوو. پیاوێکی خوا هەقە بە دینیش بوو. ڕۆژێك ئەچێتە لای شێخ بابەعەلی تەکیەیی ئەڵێ: یا شێخ! من لەو خوارە لەسەر مەزهەبی حەنەفی بووم، کە هاتمە ئەم شارە بووم بە شافیعی؛ بەڵام هەر لەسەر دوو مەزهەب دەستنوێژ ئەشۆم؛ ئیمڕۆ نوێژی نیوەڕۆم کرد هەستم بە تەڕاییەك کرد لەناو دەرپێکەما پەیدا بوو، لە پاش نوێژەکە کە بۆنم کرد بۆنێکی پیسی لێ هات، ئەوە چۆن ئەبێ؟ شێخ بابەعەلیش ئەڵێ: خوا سەلامەتت کا، نەوەك لەسەر دوو مەزهەب، بەڵکوو بە هەر چوار مەزهەب تۆ گووت کردووە بە خۆتا قاچوقولت بشۆ و نوێژەکەت بگێڕەوە!.

٣٠. لەو بنارە کابرایەك ڕێی ئەکەوێتە ماڵێك (وەکوو بۆیان گێڕامەوە لە دێی تەمووتە). کابرایەکی میوان لەو ماڵە دانیشتبوو نانیان بۆ دانابوو نانی ئەخوارد، خاوەن ماڵەکەش لە ماڵ نەبوو. کابرای ڕێبوار سەلامی کرد و لەولاوە دانیشت. کابرای میوان جوابی سەلامەکەی دایەوە ئیتر خوڵکی نەکرد بۆ نان‌خواردن، وا دیار بوو یەکتریشیان ئەناسی. کابرای ڕێبوار وتی: کە هاتم بەسەر ماڵی ئێوەدا تێ‌پەڕیم. کابرای‌تر وتی: ڕێگەکەت لەوێوە بوو. وتی: ژنەکەت سکی پڕ بوو. وتی: خۆیشم ئەزانم. وتی: مناڵی هێنا. کابرا وتی: ژنێ سکی پڕ بێ ئەبێ مناڵی ببێ. وتی: دوو کوڕی هێنا. وتی: خەسوویشم هەموو جار دوو دووی ئەهێنا. وتی: یەکێکیان مرد. وتی: دیارە ژنەکەم نەیتوانیە شیر بە هەردووکیان بدا؛ شیری کەم بوو. وتی: لە پاش بەینێك ئەوی‌تریشیان مرد. وتی: کە براکەی مرد وا دیارە ئەویش لە بەر جیابوونەوەی ئەو لێی، مردووە. وتی: زۆری پێ نەچوو دایکەکەشیان مرد. وتی: لە تاو کوڕەکانی سوێی بووەتەوە. وتی: وا دیارە خواردنەکەت بەلەزەتە. وتی: لەبەر ئەوەی ئاخر منیش ئەیخۆم؛ وتی: کابرا خەیاڵ مەکە؛ تۆ بیت و ئەم هێلکەوڕۆنە ناچێژیت.

٣١. کابرایەکی خەڵکی ئەو وڵاتە بۆ کاسبی چوو بوو بۆ ئەو وڵاتی ئەستەموڵە، بە هەر چەرمەسەری و پەرێشانییەك هەبوو شتێکی پێکەوە نابوو. ژنێك خستبوویە دوای خۆیەوە خۆی لێ مارە کردبوو. ژنە کۆلکە ماڵێکی هەبوو، پیاوەی بردبووە لای خۆی. ڕۆژێك پیاوەکە یەکێکی خەڵکی وڵاتی خۆیانی بەرچاو ئەکەوێ، بردیە ماڵەوە. ئەم پیاوەش کەوا ڕێ کەوتبووە ئەو وڵاتی ئەستەموڵە و لەوێ بە هەژاری ئەژیا و کەوتبووە داوی ئەو ژنەوە، لە کاتی خۆیا و لە وڵاتی خۆیا پیاوێکی پیاو و دەوڵەمەند

بوو. وا دیار بوو شتێکی لێ قەوما بوو؛ وڵاتی بەجێ‌هێشتبوو کەوتبووە غەریبی و کەوتبووە لای ئەو ژنە.

کە چوونەماڵەوە، ژنە نانی بۆ میوانەکە دانا و میوانیش زۆری برسی بوو دەستی کرد بە نان‌خواردن. ئەمجا کابرا خەبەر و حاڵ و ئەحواڵی وڵاتی خۆیانی لێ پرسی وتی:

توخوا ئێستا «باشە»ی کوڕم چۆنە؟ کابرای میوان وتی: کوڕی وا هەر نییە، هەموو ئەو وڵاتە بە سەری ئەو سوێند ئەخۆن. وتی: ئەی دایکی چۆنە؟ وتی: مەپرسە، ئەگەر چاکی و بە سەرو بەری ئەو نەبێ باشەی کوڕت ئاوا دەرناچێ. وتی: ماڵەکە چۆنە؟ وتی: دیواخانەکە شەو و ڕۆژ ئەگەڕێ. وتی: مەڕوماڵات چۆنە؟ وتی: بارەباڕی مەڕ و بەرخ ئێوارە و بەیانیان لە دەورەی ڕەشماڵا ئەلێی دەنگی ساز و ئاوازی بەهەشتە. وتی: توخوا گەماڵە بۆرە چۆنە؟ وتی: بە دەوری ڕانەکەدا هەروەکوو شێر ئەسووڕێتەوە؛ بۆچ دێڵێ یەکێ توخنی ئەو مێگەلە بکەوێ. وتی: هیچ خەبەرت لە ماینەکەوە هەیە؟ وتی: ماین، ماین نییە؛ دوو جوانووی بە شوێنیەوەیە. لەناو قەرسێڵ و سێپەڕدا بە ئارەزووی خۆیان ئەلەوەڕێن. ژنەکە زانی وا پیاوە بەو جۆرە دەستی کردووە بە قسەکردن و بە شان و باڵی سامانی مێردەکەیا دێت و مێردیش وا گوێی بۆ ڕاگرتووە هات نانەکەی لە بەردەم کابرای میوانی هاوشاریدا هەڵگرت. میوانیش هێشتا تێری نەخواردووە. ئەمجا کابرا وتی: دەی چاوەکەم لەسەر قسەکانت بڕۆ، کابراش وتی: بپرسە تا وەڵامت بدەمەوە. کابرا وتی: قسەکانتم ئەوەندە پێ‌خۆشە ئەمەوێ دیسان لێت بپرسمەوە: گەماڵە بۆر چۆنە؟ وتی: وەڵڵا تۆپی. وتی: چۆن، بۆچی تۆپی؟ وتی: گورگ نایە ناو ڕانەکە کەلاکێکی زۆر کەوتبوو ئەویش خەریکی خواردن بوو، ئێسقانێ گیرایە گەرووی و خنکا.

وتی: بەڕاست مەڕەکان نەمان؟ بۆچی نەمان؟ وتی: پێم وتی، گورگ تیان نیشت. ئەویش لەبەر ئەوە بوو ماینە کەوە بە خۆی و جوانووەکانیەوە دز بردنی ئیتر گورگ بە تەواوی دەرفەتی هێنا و لە گۆشەیەکەوە کەوتە ڕانەکە. وتی: ئەی باشە، دایکی باشە نەیتوانی باشە بنێرێت چارێك بکا؟ وتی: دایکی باشە مرد. وتی: بۆچی دایکی باشە مرد؟ لەبەر چی مرد؟ وتی: ئەوەندە گریا بەسەر تەرمی باشەی کوڕتا هەتا سویّ بووە و مرد. وتی: بۆچی باشەی کوڕم مرد؟ بۆچی مرد؟ وتی: ماڵەکەتان ڕووخا کەوت بە سەریا بوو بە ژێرەوە و مرد.

ژنەش لەولاوە گویّ لەم قسانەیە، هەرچەندە تیّ ناگا کە ئەم کابرایە چی ئەڵێ، بەڵام بە ڕەنگ هەڵبزرکاوی مێردەکەیا ئەزانیّ خەبەری ناخۆشە. ئەو زۆری پیّ خۆش بوو. کابرای میوان هەر هەستا کردی بە کەوشەکانیا و بۆی دەرچوو وتی: لە خراپی ئەم ژنەت لەوانەیە ئەم ماڵەش بڕووخێت با بڕۆم!.

٣٢. حاجی برایماغای عەنبار جارێك لەگەڵ هەمزەی پیاویا ئەچنە سابڵاغ و لە مزگەوتی سوور نوێژی جومعە ئەکەن، ئیشی ناوشاریان تەواو ئەبیّ و ئەگەڕێنەوە. لە پاش چەند ڕۆژێك حاجی برایماغا ئەپرسیّ لە هەمزە و ئەڵێ: ئەریّ هەمزە! چ ڕۆژێك بوو نوێژی جومعەمان کرد لە مزگەوتی سوور؟ ئەویش ئەڵێ: ئاغا باقڵێکم ڕۆژی سێشەنبە بوو! ئاغا ئەڵێ: عامفەرم، وەڵڵا من لەبیرم نەبوو کە ئەو ڕۆژە بوو.

٣٣. جاران ئەمە هەبوو: دوو کەس یا سیّ کەس لە ئەسپێکا ئەبوون بە شەریك، سا یا میراتی بوایە یا کڕین. لە «مایندۆڵ» دوو کابرا بە شەریکی ماینێکیان کڕیبوو، ڕۆژێك یەکیّ لە کابراکان بە دار

هاتە وێزەی ماینەکە زۆری لێ دا. ئەوی‌تر وتی: ئەوە بۆ لەو بەستەزمانە ئەدەی؟ ئەمیش وتی: برا من لە بەشەکەی خۆمم داوە تۆ هەقت چییە؟!.

٣٤. مەلا سمایل کانیسکان جارێك لە «زێوە»ی لای پیرەمەگروون وەعزی ئەدا ئەیوت: لە «بدایع الظّهور»دا ئەفەرموێ: هەرکەس ناوی ئادەم و حەوا بنووسێ و لە ماڵا هەڵیواسێ شەیتان ڕوو ناکاتە ئەو ماڵە. مام سمایلێکی زێویەیی هەبوو، لە وەعزەکەدا بوو، سەرێکی بادا و وتی: مەلا ئەوە تۆ بە ڕیشی خۆت پێ ئەکەنی یا بە هی ئێمە؟ ئادەم و حەوا لە بەهەشتدا لەگەڵ خودا بستێك بەینیان بوو، شەیتان چوو هەڵیفریواندن، ئێستە چۆن کۆ لە ناوەکەیان ئەکاتەوە؟ تۆ قسەیەك بکە کە ئەقڵ بیگرێ. مەلا سمایل وتی: باوکم! من بڵێم چی «بدایع الظهور» وا ئەفەرمووێ، نە من پاژنە هەڵکێشم و نە تۆیش مشتووی هەمانە.

٣٥. جارێك ژنە کوردێك ڕێی ئەکەوێتە سولەیمانی، تووشی ئەحەی کرنوو ئەبێ لێی ئەپرسێ: ئەرێ لالە! بازاڕی نەوات فرۆشەکان لە کوێس؟ ئەویش ئەڵێ: خوشکم لە ژێرە ئاوەڵ کراس و کەواکەی خۆتایە. ژنە ئەڵێ: ئەی گووی تۆی لێ نەوارێ! دەم و دگانی ئێژی چیغی شڕە و دریاگە وەسەر دەوارا. من ئێژم نەوات ئەو ئێژێ کەوات وا ئەزانێ تاریەرە و لە هۆز بەجێ ماگم.

٣٦. حەمەعەلی مەلا محەمەد گێڕایەوە وتی: لە مزگەوتەکەی «بێژوێ» دوو قەبر هەیە ئەڵێن هی ئەسحابانە. ڕۆژێك کابرایەکی «باناڵێ»ـیی ئەچێتە بێژوێ و لە مزگەوتەکەدا لەگەڵ یەکێکی بێژوێی قسەیان ئەگیرێتە یەك و دەست ئەکەن بە قسە و پلار گرتن لە یەك.

باناڵێییەکە بە بێژوێییەکە ئەڵێ: ئێوە هەر مەگەر خەریکی نووکە نووك کردن بن، بزانە قەت لە شەڕێکا توانیتان دەرکەون؟ بێژوێییەکەش دەست بۆ قەبرەکان ڕائەکێشێ و ئەڵێ: «ئێمە خەریکی نووکە نووکین؟ ئەی ئەو دوو شێرە کێ لەوێ ڕایکێشاون و شەهیدی کردوون!»

.٣٧ کابرایەکی جاف ساڵێك ئەچێ بۆ حەج. ئەو سەردەمە لە دەریادا پاپۆڕ و لە وشکانیا حوشتر بوو. ئەویش ئەوانەی هیچ نەدیبوو، چ لە پاپۆڕەکەدا و چ لە سواری حوشترەکەدا زۆر تووشی عەزیەت بووبوو. جا ئەیوت: ئێمە ئەم هەموو عەزیەتەمان کێشا و ئەچین بۆ ماڵی خوا، خوا لە ماڵەوە بوایە خاس بوو، ئەم جرت و فرتەمان بە هیچ دەرنەچوایە. بڕواش ناکەم لە ماڵەوە بێ؛ چونکە تاقەتی ئەم گشت ڕەوەیە نییە کە ئێژی ئەچن بۆ سەراوی سوبحاناغا ئاو ئەخۆنەوە!.

.٣٨ هەر حەمەعەلی گێڕایەوە وتی: لە «قەشان» پارچە بەراوێك هەیە دانراوە بۆ مەلا، کە بیکا بە بێستان بۆ خۆی. بێستان هاتۆتە بەرهەم و خەیار و ترۆزی و هەموو شتێکی تێدایە. ڕۆژێـك دەستەیەك ئەچن خەیارێکی زۆر ئەکەنەوە و لەسەر کانییەکە لە نزیك بێستانەکەوە دائەنیشن و دەست ئەکەن بە خواردنی. مەلا ئەچێ بە سەریانا ئەزانێ ئەمە لە بێستانەکەی ئەویان هێناوە.

مەلا حەسەن هەبوو لە پێشا لە «وڵاغلوو» بوو، ماڵی باری کردبوو چووبوو لە قەشان دانیشتبوو. مەلا ئەچێتە لای مەلا شکات ئەکا ئەڵێ: ئەو دەستەیە هاتوون بێستانەکەمیان ڕنیوە و هەموویان خواردووە. مەلا حەسەنیش ئەڵێ: مەلا، ئەمانە تاوانێکی گەورەیان کردووە، شەرع ئەفەرموێ: ئەمانە بە ڕۆژ بیانبە لە بێستانەکەدا حەپسیان بکە بە شەویش بیانبە

ماڵەوە نەوەك هەرا بکەن هەتا سێ چوار ڕۆژ پاش ئەوە بیانهێنەوە، منیش خۆت ئەزانی لەسەر سەفەرم تا ئەو وەختە ئەگەڕێمەوە، کتێب چی فەرموو بەو جۆرە جەزایان ئەدەم.

مەلا ئەڵێ: کەواتە مەلا حەسەن بەو جۆرە تۆ ئەڵێیت من ئەبێ دابەستە ڕابگرم. من ئەم شەرعە ناکەم و هیچم ناوێ با بچن بە ڕێی خۆیانەوە. مەلا حەسەن ئەڵێ: «باوکم نابێ، ئەگەر تۆ ئێستە بەرەڵایان بکەی ئیتر فێر ئەبن، دزی ڕەچاو ئەکەن و تۆیش ئەبێ بە هاوبەشی گوناحیان». مەلا خواخوای بوو ڕزگاری ببێ؛ کەچی مەلا حەسەن وازی نەئەهێنا، ئەیوت: حوکمی شەرع ئەبێ جێبەجێ بکرێت!.

**٣٩.** «سەی زوبەیری تاڵشی» هەبوو گێڕایەوە وتی: لەو «لاجان»ـە بۆ «پەسوێ» ئەچووم بۆ خزمەتی مەلا عەبدوڵڵای پەسوێ بۆ خوێندنی ڕیازیات. ڕێم کەوتە ماڵێك بە میوانی، پیاوەکە لە ماڵ نەبوو، خێزانەکەی هات بە پیرمەوە ڕایەخی بۆ ڕاخستم، بە خێرهاتنێکی گەرموگوڕی کردم. هەر خێرا مەنجەڵی خستە سەر ئاگر. لەولاوە حەوجۆشی دایە پاڵ بۆ چا، هەر بە دەمیشیەوە بەخێراتنم ئەکا. ئەوەندە ماریفەتی لەگەڵ نواندم، خۆم لە خۆما تەریق ئەبوومەوە، زۆری پێ نەچوو نانێکی تێروتەسەلی دروست کرد و چای پێ گەیاند.

لەو کاتەدا کە ئەو هەموو شتێکی حازر کردووە، مێردەکەی هاتەوە. چاوی بەو نان و خوانە و بە من کەوت ناوچاوی تێك دا و پیشی کرد. ئاخرەکەی خۆی بۆ ڕانەگیرا وتی: ئەرێ ئافرەت هیچ وە بزانی من دیواخانم داناوە تۆ لە ماڵی باوکت ئەمەت هێناوە وا ئەم خوانەت ڕازاندووەتەوە بۆ ئەم کابرا گەڕیدەیە؟ وتی: منیش ئەوا وەختە بچم بە عەرزەکەدا.

ژنـە وتـی: پیاوەکە تۆ بۆچ وائەکەی؟ ئەمە مەلائیکەی سـەر عەرزە، ئەم ماڵە هەرچەندە میوان ڕووی تێکا خوا زیاتری ئەکات؛ تۆ بۆچی خوا وای لێ کردووی؟ ڕوویش ئەکاتە من ئەڵێ: کاکە مەلا تۆ فەڕ و بەرەکەتت هێناوە، بۆ خاتری ئەو قورعانە کە خوێندووتەوە ئەگەر دڵگران ببی و نانی خۆت بە تەواوی نەخۆی! وتی: بە هەرجۆر بوو چەند پارووییەکم خوارد و لێم دا ڕۆیشتم. ژنە بەڕێی کردم تا بەر قاپی و هەر دڵی ئەدامەوە، پیاوەش هەر بۆڵەی ئەهات و لە شوێنی خۆی نەجووڵا.

وتی: چووم بۆ پەسوێ و لە پاش چەند مانگێك گەڕامەوە بۆ سابڵاخ. لەم سەریشەوە ڕێم کەوتە ماڵێك و لام دا. هەر کە سەرم کرد بە ماڵەکەدا پیاوێك بە ڕوویەکی خۆش و دەمێکی بە پێکەنینەوە پێشوازی کردم و بردمیە ژوورەوە، ڕایەخی بۆ ڕاخستم و وەکوو شەکر بە دەممەوە ئەتوایەوە. گورج هەستا ملی گیسکێکی گرت دای بە عەرزا سەری بڕی، گرووی و مەنجەڵی هێنا خستیە ناویەوە و نایە سەر ئاگر و حەوجۆشی خستە پاڵ بۆ چا. وتی: ژنێکیش لەولاوە دانیشتبوو هەر پرتە و بۆڵەی لێوە ئەهات. حەرام بێ، لە شوێنی خۆی نەجووڵا. کە سەیری ئەکردم وەکوو سەیری بەراز بکا وابوو. کابرا بە هەرجۆر بوو ژنەی هەستان برنج و ڕۆنی پێ هێنا و پێی خستە سەر ئاگر.

بەڵام پیاوەکە خۆیشی هەر خەریکە، بە دەست ئیش ئەکا و بە دەم قسەی خۆش لەگەڵ من ئەکا. ژنەش لە خوتەوبۆڵە بەولاوە هیچی تری لە دەست نایە، تا دەست ئەبا بۆ شتێك وەکوو بکێشن بە تەوقە سەریا وایە. وتی: منیش بەمە زۆر عاجز بووم، بەڵام ڕووخۆشی پیاوەکە و گفتولفتی گلی دابوومەوە.

بە هەرجۆر بوو نان پێ‌گەیشت و ژنە نانی تێ‌کرد. بە لالووتیکەوە هێنای

داینا و گوێم لێ بوو وتی: ها بیکەنە قوزڵقورتتان. من دیواخانم ڕاگرتووە، هەر ڕۆژە نە ڕۆژێك یەكێكم بۆ دێنێت.

وتی: بەڕاستی زۆر دڵم نارەحەت بوو. لەگەڵ پیاوەکەدا پێکەوە نان ئەخوێن وتم: «سبحان الله». پیاوە وتی: مامۆستا گوێ مەدەرێ نانی خۆت بخۆ، ماڵ ماڵی منە، ئەو سەعاتە پێ زیندوو ئەبمەوە کە لە خزمەت زاتێکی وەکوو تۆدا دانیشم. وتم: برا «سبحان الله»کەم بۆ ژنەکەی تۆ نەبوو بۆ بەسەرهاتێك بوو کە لەم سەفەرەدا چاوم پێ کەوت.

وتی: توخوا مامۆستا چی بووە؟ وتی: منیش بە تەواوی بۆم گێڕایەوە کە چەند مانگێ لەمەوپێشتر ئەچووم بۆ پەسوێ، لە فلانە شوێنا ڕێم کەوتە ماڵێك. ژن و مێردێکی لێ بوو ژنەکە هەتا بڵێیت بەرچاوتێر و شاژن بوو، پیاوەکەی بە پێچەوانەی ئەو زۆر چرووك و بەرچاوتەنگ بوو؛ کەچی هاتمە ئێرە بە عەکسی ئەوەم چاوپێ کەوت؛ پیاوەکە تا ئەوپەڕی پیاوەتی پیاو، ژنەش نازانم بڵێم چی.

وتی: پیاوەکە زەردەخەنەیەکی کرد و دەنگی نەکرد. وتم: تۆیش ئەبێ لەم زەردەخەنەیەی خۆتم تێ بگەیەنی. وتی: مامۆستا ئەو ژنەی کە تۆ لەوێدا چاوت پێ کەوتووە ئەوە خوشکی منە. ئەم ژنەی منیش خوشکی مێردەکەی ئەوە!.

٤٠. پیاوێکی دەوڵەمەند کە بە چرووکی ناوبانگی دەرکردبوو، ڕۆژێك پیاوێکی ماقووڵ ئەبێ بە میوانی. خزمەتکارەکە قاوەیان بۆ دێنێت و فنجانێکیش بۆ ئاغەی تێ ئەکا. ئاغەی کە ئەیخواتەوە پێی ئەڵێ: ئەرێ هەتیو! ئەمە چییە؟ ئەم قاوەیە هەم زۆر تاڵە و هەم لەبەر کۆنیش بۆگەنی کردووە. خزمەتکارەکە ئەبزڕکێ، نازانێ میوانەکە هەر دانیشتووە

ئەڵێ: ئای بەخوا ئاغە، نەمزانی بەخوا لە بیرم نەبوو چووم لە قاوەی میوانەکە بۆ جەنابیشتم تێ‌کرد!.

٤١. لەو ماڵە دوو سێ مناڵیان هێنابوو خەتەنەیان ئەکردن، کچێك لەوێ بوو ئەویش دەستی کرد بە گریان و هاوار هاوار. وتیان: تۆ بۆچ ئەگری؟ خۆ تۆ خەتەنە ناکەن. وتی: ئاخر بۆ منی تیژ ئەکەن!.

٤٢. کابرایەك بوو «پیرۆت» ناو، خاوەنی مەڕوماڵات و سامانێکی زۆر بوو؛ بەڵام لەبەر پیسکەیی، خواردنی شەو و ڕۆژی خۆی و منداڵانی بووبوو بە ساوەر. ژنەکەی هەرچەندە ئەپاڕایەوە کە پیاوەکە خوا قەبووڵی نییە، خۆم و مناڵەکانم وشك هەڵگەڕاوین بە ساوەر خواردن، خوا نەیبڕێ دەوڵەتێکی زۆرت هەیە با هیچ نەبێ حەفتەیەك، جارێکیش برنجێکمان دەرخوارد دەی، سوێمان بووەوە.

پیاوە وتی: دایکم ساوەر، باوکم ساوەر، ئافرەت تۆ ئەقڵت نییە، ساوەر ئاوسێ، پیاو قەڵەو ئەکا. لەسەر پێشاو زوو دەرئەچێ، خواردنی پێغەمبەرانە، قەراوانەی پڕی شوانانە، گەنمی بەهارەی کوێستانە، بەرداش خۆی لە بەریا ناگرێ، تەشپی لاوەشی بۆ ئەگرێتەوە، لە زستانا ئازوخەی ماڵە، لە بەهارا خواردنی مناڵە، لە هاوینا ڕەنگی ئاڵە، لە پاییزا خێری خوایە، لە هەر چوار وەخت بۆمان مایە، جارێکی تر ناوی نایە، خوا یەکە و نەبووە بە دوو، بۆ ساوەرە تۆی دا بە شوو!.

ئافرەتی هەناسە سارد هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە بچێتە لای مەلاکەی دراوسێیان دەردەدڵی خۆی و مناڵەکانی لەلا بکا. وتی: مامۆستا چ بکەم؟ خۆم و مناڵەکانم وەختە سوێمان ببێتەوە بۆ چێشتێکی برنج، مێردەکەشم ئەو هەموو سامانەی هەیە ئێمەی گرتۆتە ساوەر. لە ساوەر

بەولاوە نابێ شتێکی‌تر بخۆین. لە ڕێی خودا بەڵکوو چارێکمان بکەی و لەم ڕۆژە ڕەشە ڕزگارمان بێ.

مەلا زۆر دڵی پێ سووتا وتی: خوشکم بچۆ بەڵکوو چەند دەنکە حەبی سێوی تورش پەیدا کەی لەگەڵ چەند هەودایەکی جاڵجاڵۆکە پێکەوە بیسووەوە و بیدە لە لووتیا ئیتر وازی لێ بێنە بۆ من. ژنە چوو بە هەرجۆر بوو چەند ناوکە سێوێکی پەیدا کرد و لەگەڵ جاڵجاڵۆکەدا وەکوو مەلا وتی وای لێ کرد. سەیری کرد مێردەکەی لە خۆی بوردووە و بێ‌هۆش بوو. ژنە شپرزە بوو هات بۆلای مەلا. مەلا وتی: خەمت نەبێ وازی لێ بێنە تا شەوێ.

شەوێ، مەلا دوو فەقێی ئازای هەبوو، وتی: لەگەڵم وەرن. هەرسێکیان چوون کابرایان هەڵگرت و جلەکانیان لەبەر داکەند. کفنیان کرد و بردیان بۆ سەر قەبران، چاڵێکیان بۆ هەڵکەند و خستیانە چاڵەکەوە، مەلا ئەوی پێویست بوو بە فەقێکانی وت.

کابرا زۆری پێ نەچوو هاتەوە هۆش، تەماشای کرد ئەوا کفنی پێوە پێچراوە لەناو قەبرایە. وتی: «ئۆف، ڕۆژەکە بوو کە لێی ئەترسام». یەکێ لە فەقێکان چووە لای سەریەوە وتی:

چەند خوا؟ وتی: هەر یەك خوا.

چییە ناوت؟ قوربان پیرۆت.

چییە خواردن؟ نانی هەرزن.

شیوی ماڵت چییە بە ناو؟ خوا نەیبڕێ ساوەر بە ئاو.

نابێ برنج لەوێ هەبێ؟ ساوەر هەبێ ئەو نابێ بێ.

چی دی نابێ بخۆن ئێوە؟

وتی: قوربان ساوەر بابە، ساوەر داکە، ساوەر ئەبێ، برنج نابێ، ساوەر

جێگای گشت پیتاکە.

فەقێ کوتەکێکی پیاماڵی و وتی:

ڕۆژی ڕەشت ئاوا ئەبێ. هاتنە وێزەی بە کوتەك دایانگرت، مەلا. کە ئەو بە ئەنکیر مەنکیری ئەزانی وتی: هەرکەس ساوەر بخوا لە قەبرا کوتەککاری ئەکرێ و دوای قەبریش ئەخرێتە جەهەنەمەوە. هەرکەسیش برنج و شتی خۆش بخوا لە قەبرا بە باوەشێنی ڕەحمەت باوەشێن ئەکرێ و لە دوای قەبریش ئەچێتە بەهەشتەوە. دە بگرە بخۆ بۆ خۆت.

هاتنە وێزەی دەستیان کردەوە بە کوتەککاری کردنی. ئەوەندەیان لێ دا تا بێهۆش بووەوە، ئەمجا هەڵیانگرت و هێنایانەوە بۆ ماڵەکەی. کفنەکەیان لەبەر داکەند، جلەکانیان کردەوە بەری و لێیان دا ڕۆیشتن.

کابرا کە کەوتە بەیانی هاتەوە هۆش. خۆی بە زیندوو بینی، قەبر و ئەنکیر و مەنکیرەکە نییە. گەلێ شوکری خوای کرد، هەرچەندە هەموو لەشیشی شکا بوو، بەڵام هەر خوی ڕانەگرت، دەستبەجێ چوو بۆ بازاڕ لە برنج و ڕۆن، لە میوە، لە نوقڵ و نەبات، لە خواردنی خۆش، هەرچی بوو لە بازاڕا هەمووی کڕی و دای بە کۆڵی چەند حەماڵێکا و هاتنەوە بۆ ماڵەوە. ژنەکەی کە ئەمەی چاوپێکەوت هەروا حەپەسا. قەت شتی وای نەدیبوو. وتی: پیاوەکە ئەمە چییە؟ وتی: ئافرەت دەنگ مەکە من بە چاوی خۆم چاوم پێکەوت هەرکە ساوەر بخوا ئەبێ لەگەڵ ئەوا کوتەك بخوا، دوای ئەوەش ئەبێ بچێتە جەهەنەم؛ هەرکەسیش خواردنی خۆش بخوا جێگای خۆی و باوباپیری بەهەشتە. تا من ماوم ئیتر ساوەر نایە بەم ماڵەدا، لە خواردنی خۆش بەولاوە هیچیتر ناچێتە سەر زمانی ئەم منالانەم، جارێکیکە تۆبە لە ساوەر خواردن!.

**٤٣.** حەمەبەگی حاجی ڕەسووڵبەگ گێڕایەوە وتی: کابرایەك هەبوو لەو جافەتییە «شانەزەر»یان پێ ئەوت. دۆستێکی هەبوو لەناو گۆرانەکانا زۆر زۆر هاتوچۆی ئەکرد. پێ ئەوت: برا تۆ بەری جووت و گاکەت بەشت ناکا؛ من دەستم ئەڕوا لەلای مەحمووپاشا، پێی ئێژم بتکا وە سەگەوان لەلای خۆی. هەم ئەوی وە ئێمە، هەم نانێکی فرەشت دەس ئەکەوێ. بە بیانووی ئەم قسە و ئیتر هەموو ڕۆژێك لە ماڵی کابرای گۆرانە بوو. ئێوارێ گالۆکی خۆی هەڵئەگرت و ئەچووەوە بۆ ماڵی خۆی لە هۆبەکەیان، بەیانی دیسان ئەهاتەوە. کابرای گۆرانیش لەبەر ئەوە ڕۆژیان کوڵابوو بە دەست کوردەکانەوە، لە بەڵێ بەولاوە و لە نان بۆ دانان بەولاوە هیچی‌تری بۆ نەمابوو.

ئەو ساڵە لەسەر چوو، کەوتە پاییز عێل گەڕایەوە بۆ گەرمیان. کەوتە بەهار دیسان عێل سەرەوژوور بووەوە بۆ کوێستان. کابرا ناسراوێکی‌تری هەبوو لەو دەشتی شلێرە بیستبووی کە نەخۆشە، هەر بەدەم کۆچەوە چوو سەرێکی لێ دا و بۆ نیوەڕۆژە لەوێ بوو. پاشان وتی: برا وا کۆچ ڕۆیشت، توێ برۆم پیا بگەم. لێرە وە سەر پێوە هاتم سەرێکتان لێ دەم، ئێمە ئەچین بۆ کوێستان. ئەگەر نەخۆشەکەتان مرد خۆتان خۆش ون، ڕێگام دوورە ناتوانم لە کوێستانەوە بگەڕێمەوە. ئەگەر وەخێر لەو سەرەوە گەڕاینەوە بۆ گەرمیان لا ئەدەم و سەرەخۆشییەکی‌ترتان لێ ئەکەم؛ ئیتر وە دوعا.

کە گەیشتنە کوێستان دەواریان دامەزراند و جێگیر بوون، پاشان دەستی کردەوە بە هاتوچۆ کردن بۆ ماڵێ گۆرانەی دۆستی. ئەمجارە ڕۆژێك بە کابرای گۆرانەی وت: برا وە پاشام وت بتکا وە سەگەوان. ئەویش فەرمووی: خاسە. بەڵام با هەر لە ئێستەوە پێت بێژم خاسە، وا بزانە تۆ

ویت وە سەگەوان لای پاشا. پاشا مرد تۆ ئیتر سەگەوانییەکەت نامێنێ، ئەکەویتەوە بارەکەی خۆت. من هەر لە ئێستەوە خەریك ئەوەم ئیشێکی‌ترت بۆ بدۆزمەوە. وە خێر کە عێل گەڕایەوە بۆ گەرمیان ئەو وەختە خەوەرت بۆ ئەنێرم تۆیش بێ بۆ ئەوێ. تۆ بیت بۆ ماڵی ئێمە، ئیشەکەت پێ ئێژم و یەك دوو ڕۆژ چاوت پێمان ئەکەوێ و دوای ئەوە ئەگەڕیتەوە بۆ کوێستان. ئەگەر ئەو وەختە چەرچیش هات بۆ ئێرە و موورگی پێ‌وو توخوا نەختێ موورگی کوێستانیش بێرانە بۆ دەزوێنکی ئەو کەنیشکە بێ‌فەڕە بچووکە کە هەر داوا لە دایکی ئەکا. ئیتر ئەم قسەیەش بوو بە پێخۆری ئەو ساڵەیان. کابرای گۆرانەش چاری نەئەما هەر ئەیوت: خوا لە برایەتی و هاوسەری کەمتان نەکا.

٤٤. مەلا ساڵحی کۆزەپانکە لەلایەن حەجەوە وەعزی دائەدا کە هەرکەسە جارێك بڕوا بۆ ماڵی خوا، خوا لە هەموو گوناحی خۆش ئەبێ. حسەینی مەلا، لە کۆڕی وەعزەکەدا بوو وتی: مامۆستا ئەگەر یەکێك نەیبوو ئەبێ چی بکا؟ مەلا ساڵحیش وتی: کە نەیبوو هیچ، با هەر لۆ خۆی گوناحان بکا. وتی: ئەگەر خانوویەکی هەبوو خانووەکەی بفرۆشێ و پێوە بچێ بۆ حەج یا هەر گوناحان بکا؟ وتی: حسەینی مەلا، خۆ من کفرم نەکرد ئەو قسەیەم کرد. دەبا بیفرۆشێ و بچێ حەجی خۆی بکا. ئەمجا وتی:

توخوا مەلا ساڵح! من بە تۆ ئەرێم، ئەوا کابرایە خانییەکەی فرۆشت و چوو لۆ عەجێ. ئەوا عەجی کرد یا دێتەوە یا نایەتەوە. ئەگەر هاتەوە لە کوێ دانیشێ؟ ئەگەر نەهاتەوە ئەبێ لە عەجێ لە ماری خودادا بێ، ئەو وەختە خودای لێ ناپرسێ: ئەرێ هەی کەرا! تۆ چوویت خانی

خۆت فرۆشتییە هاتوویت لێرە لە بن ماری منا دانیشتیت و منەتی من هەردەگری. دە هەستە هەرۆ لۆ خۆت لۆ کوێ دەچی بچۆ. کە هاتەوە لێرەش خانی نەمایە، دەست لە گونانی بەرەو ژێرتر. ئەمە ڕێگایە تۆ لۆ ئەو غەریبەی دائەنێی؟ مەلا سالحیش وتی: حسەینی مەلا، من چوسوانم تۆ بوویتە معامی ئەو کابرایە دەبا نەچێت و ملی ورد ببێ. هەر لۆ خۆی گوناحان بکا تا چاوی دەردێت وە بزانی عەج لۆ من دەکا؟.

٤٥. حسەینی مەلا، جارێکیان ئەچێ بۆ حەج و هەمو شتێکی حەجەکە بەجێ دێنێت، پاشان سەر بەرز ئەکاتەوە ئەڵێ: خودایە چ خزمەتی دیکە ماینە تا بیکەم، ئەگەر نەماینە ئەوا خوا عافیز!.

٤٦. لەو موکریانە، یەکێك لە ئاغاکان لەگەڵ خزمەتکارێکیا ئەچن بۆ سابلاخ؛ ئاغە خزمەتکارەکەی ئەنێرێ بۆ بازاڕ، شەکر و چا بکڕێت و بیهێنێت. «چا» نابێت؛ ئاغا زۆر تووڕە ئەبێت و دەست ئەکا بە جنێودان پێی. پێی ئەڵێ: شەرت بێ جارێکی کە ناردتم بۆ هەر ئیشێک، ئەبێ دوو ئیش بکەیت. هەر لە ماوەی ئەو سەفەرەیانا ئاغا نەخۆش ئەکەوێ. خزمەتکارەکەی ئەنێرێ بەشوێنی حەکیمدا. خزمەتکار ئەچێت و دێتەوە، دوو کەسی لەگەڵدایە! ئاغا ئەپرسێ ئەوە چییە؟ خزمەتکارەکە ئەڵێ: ئاغە، ئەوە یەکێکیان حەکیمەکەیە، ئەوی‌کەشیان خۆت فەرمووت: ئەگەر ناردتم بۆ ئیشێک، ئەبێ دوو ئیش بکەی، گۆڕ هەڵکەنە! ئەگەر خوا شیفای دایت بە حەکیمەکە باشە، ئەگەر خۆ مردیشی، ئەوا گۆڕهەڵکەنم هێناوە گۆڕت بۆ هەڵکەنێ؛ ئەوە هەردوو ئیشەکەم بە یەك جار کردووە!.

٤٧. کابرایەك دۆستێکی هەبوو، بەوە خۆی ئەبردە پێشەوە لە لایەوە کە ئەیوت: من زۆر ئازام و باکم لە هیچ نییە. ڕۆژێك ئەم کابرایە

لە دزیدا گیرا و خستیانە ژێر ئەشکەنجە و دارکاری. داری وایان لێ ئەدا ئەگەر لە بەرازیان بدایە ئەیبۆڕاند، کەچی ئەم ورتە لە دەنگی نەئەهاتە دەرەوە. لە پاشا یەکێ لێی پرسی: ئەوە ئەو لێدانە ژانتی نەئەکرد؟ وتی: بەڕێوەڵڵا لەوانە بوو [گیانم]دەربچێت. وتی: ئەی بۆچ هاوارت نەئەکرد؟ وتی: ئاگام لێ بوو دۆستەکەم وەستابوو سەیری ئەکرد، منیش هەموو جار بەلای ئەوەوە ئەموت: ئازام و باکم لە هیچ نییە. لەو لێدانەما هیچ هاوارم نەئەکرد، بۆ ئەوە وانەزانێ کە من درۆم کردووە و بۆی دەرکەوێ کە من باکم لە هیچ نییە!.

٤٨. لە سولەیمانی لەو گەڕەکی «سەرکارێز»ە پیاوێک هەبوو «مەحموو»ی ناو بوو. خوشکێکی هەبوو «فاتم»ـی ناوبوو. مەحموو منالێکی زۆری بە ڕیشەوە بووبوو، هەر لە بەیانییەوە بۆی ئەکێشان تا ئێوارە باشاری نەئەکرد. فاتمیش هەر خەریکی ئاوکێشان بوو بۆیان، زۆرتریش کە مەحموو ئەچووەوە شتی ئەبردەوە، تووشی فاتم ئەبوو ئەچوو بۆ ئاو. ڕۆژێک لە کاتی هاتوچۆدا مەحموو لە فاتم ئەپرسێ: چۆنی! ئەویش ئەڵێ: چۆنم، لەم ماڵەدا خوا لە من و تۆ بەدبەختری دروست نەکردووە؛ تۆ هەر خەریکی حەماڵی و من هەر خەریکی ئاوکێشی.

٤٩. لە سنە لە مزگەوتی «فاروقیـە» لە سەردەمی مەلا عەلیدا مجەورێکی لێ بوو، شەل بوو؛ دەستێکی کوچ بوو، چاوێکی نەبوو، سەرێکی زیرگنی پێوە بوو.

میرزا مەهدییەکی مونشی هەبوو پیاوێکی دەوڵەمەند و خانەدان بوو. زەمان فێری تلیاککێشانی کردبوو. لە ڕێگای تلیاکا هەموو ماڵ و سامانەکەی دۆڕاندبوو، جێگای نەمابۆوە بۆ ستارگرتن، تەنیا مزگەوتی

فارۆقیە نەبێ. ئەگەر بە سوالّکردن، وەیا بە ڕەشەدزی دوو قرانێکی دەست کەوتایە ئەیدا بە تلیاك. سووچێکی پەنای دیتبووەوە لە حەوشەی مزگەوتەکە ئەچوو لەوێدا تلیاکەکەی ئەکێشا.

لە پاش بەینێك مجەورەکە پێ زانی و دەستی کرد بە قسە وتن پێی، کە تۆ چۆن لە حەوشی مزگەوتدا تلیاك ئەکێشی. میرزا مەهدیش لەبەر بێدەرەتانی هەموو قسەیەکی لێی قەبووڵ ئەکرد. بەڵام مجەورەکە هەر لە تامیا نەهێشت و هەر ئەیوت تۆ لە مزگەوتا چۆن تلیاك ئەکێشی.

میرزا مەهدی ئیتر لە وەزیا نەما وتی: ئاغەی خادمی شەلی کوێری کوچی کەچەڵ، خوا ئەوەنە میهرەوانی نەکردگە لەگەڵ تۆدا وا ئەوەنە تۆ لە سەری ئەکەیتەوە و مزگەوتەکەی بۆ ئەپارێزی. وازم لێ بێرا با بە دەردی خۆمەوە بتلێمەوە. چەس ئەیژی بە کراهە گیریاگی بۆ ئەوە لەسەر خوا بکەیتەوە!.

٥٠. لە «سەفەربەرلگ»ـەکەدا ڕەشبگیر بوو. زەفتیە تووشی هەرکەس ببوایە ئەیگرت، بەرگیان لەبەر ئەکرد و ئەیاننارد بۆ جەبهەی شەڕ. کابرایەکی شارەزووریيان گرتبوو ناردبوويان بۆ جەبهە. لە ڕێگادا خۆی دزیبووەوە هەڵاتبوو گەڕابۆوە. پیانوت: بۆچ خۆت دزیوەتەوە هاتوویتەوە. ئەمە غەزایە چۆن پشتی تێ هەڵئەکەی؟

وتی: برا شەڕی چی و غەزای چی، نە من ئەوان ئەناسم، نە ئەوانیش من ئەناسن. ئیتر ئەم دوژمنایەتییە لە کوێ کەوتۆتە بەینمان، تا من بچم دەست بدەمە یەقەیان؟ شەڕیش بە کۆنە قین ئەکرێ، کۆنە قینیش نییە لە بەینمانا، کەواسە حوکوومەت با هەر بۆ خۆی بچڕێ!.

٥١. حاجی عەزیزی شەرعی، خێزانەکەی لەگەڵیا ڕێ نەئەکەوت. هەر ڕۆژە نە ڕۆژێك ئەچووە لای قازی شکاتی لێ ئەکرد. قازیش ئەینارد بەشوێن حاجی عەزیزدا ئەیوت: ئەمە چییە؟ حاجی عەزیزیش ئەیوت: بڵێم چی قوربان، لە باتی کراسێك دوو کراسی بۆ ئەکەم، لە باتی کەوایەك دوو کەوای بۆ ئەکەم، خەڵکی ڕبەیە برنج ئەنێرێتە ماڵەوە، من دوو ڕبە ئەنێرمەوە، دراوسێ نیو هۆقە گۆشت ئەنێرێتەوە، من هۆقەیەك ئەنێرمەوە، ئیتر چی ئەوێ؟ قازی وتی: باشە کەسێك نییە ڕێکتان بخاتەوە با هەموو ڕۆژێ بەر دەرگای مەحکەمە نەگرن؟ ئەویش وتی: قوربان جەنابی قازی، ئەو کەسەی ڕێکی ئەخستینەوە مرد!.

٥٢. مچەی حەبێ کشمیش هەبوو لە سولەیمانی «نێرەمووك» بوو، کەوای تاقە و سەڵتەی ماوتی ڕەشی ئەکرد بە سەرا. پشتێنی پەشم و قۆندرەی نایابی بە جیرە، قژەکەی سەری هەر ئەوەندە ڕەش و جوان بوو کە شانەی ئەکرد و ئەڕژایە ناو شانی ئەتوت خەیاتەی خاوە. هەندێ جاریش ئەیهۆنییەوە ئەیکردە بسك، چەفتە و مشکی ڕیشووداری لوول ئەدا بە دەستووری ئەو سەردەمەی سولەیمانی ئەیبەست بە سەرەوە. سمێڵەکەی قەفی قەترانی هەبوو لە وسمەی ئەگرت، چاوی ئەڕشت، ڕیشەکەشی هەموو ڕۆژێ لووسوپووس ئەتاشی، پیاو کە چاوی پێ ئەکەوت ئەیوت ئەمە پاڵەوانێکە لە پاڵەوانەکان. خۆ ئێجگار کە فەقیانەکانی ئەشەکاندەوە بە لەنجەیەکەوە، پیاو ئەیوت ئەمە خەرامانی چینە. هاتوچۆی دیواخانی پیاوان و ژنانی ئەکرد، دەنگێکی ناسکی ژنانەی هەبوو، ئەتوت کچی چواردە ساڵە. کە ئەچووە ناو بازاڕ و سەر دووکانەکان پیاوان لێی کۆئەبوونەوە بە دەنگە ناسکەکەی ئەیوت: «ئەیەڕۆ لاچۆ بچۆ بەولاوە».

کە ئەچووە ناو ژنان دەنگی خۆی ئەکرد بە وەکوو پیاو بەڵام لێی نەئەهات. ژنان هەموو ئەیانناسی، بەبێ پەردە ئەچووە ژوورەوە، هەموو ماڵە گەورەکان ئەگەڕا. ژنان ئەیانویست گاڵتەی لەگەڵ بکەن لێی کۆ ئەبوونەوە لە ئەوەڵەوە ئەو بە دەنگی وەکوو دەنگی پیاو ئەچووە مەیدانەوە، بەڵام لەبەر ئەوە کە درۆ بوو ئەچووەوە سەر دەنگە ڕاستییەکەی خۆی. ئەوانیش دەرپێکەیان دائەکەند. ئیتر بە تەواوی ئەکەوتە سەر قسەی ژنانە. خۆی ئەیوت: «کچێ ئەیەڕۆ مەکە لاچۆ بچۆ بەولاوە».

ژنان و پیاوانی ئەو سەردەمەی سولەیمانی بۆ ژیان و گوزەرانی، هەموو یارمەتییان ئەدا، ئەویش بە ژیان و ڕابواردنێکی پاك و پوخت ڕایئەبوارد؛ چونکە لەناو ژنانا بۆنی پیاوی لێ ئەهات و لەناو پیاوانیش بۆنی ژنانی لێ ئەهات، بەم بۆنەوە نانی کەوتبووە ڕۆنەوە. وەیا بە کوردی‌تر وەکوو مەسەلە کوردییەکەی لێ هاتبوو. ئەمجا کە عەمری خوای کرد نازانم باجی مریەم شۆردی یا مەلا غەفووری مزگەوتی ناو بازاڕ، یا خەلیلی لای حاجی تۆفیقی پیرەمێرد؛ چونکە خەلیلیش وەکوو مچە نێرەمووك بوو. ئەمە لە مەلاکان بپرسە.

**٥٣.** جاران هەر بەینە نە بەینێك یەکێك ڕاست ئەبووەوە یا داوای خوایی ئەکرد یا داوای پێغەمبەریەتی. وەکوو ئەوە کە ئەڵێ: جارێك لەو خوارە کابرایەك پەیدا بوو داوای خوایی کرد، گرتیان و بردیانە لای خەلیفە وتی: ئەمە چییە هەر ڕۆژێ یەکێك سەر ڕاست ئەکاتەوە ئەڵێ: من خوا وەیا پێغەمبەرم؛ ئەی ئێمە چین؟ ئێمە خوای سەر زەوین، ئیتر ئەمانەی‌تر چین؟ ڕووی کردە کابرا و پێی وت: نازانم ئەم هەمووە چییە؟ ئەوە پاریش یەکێ پەیدا بوو داوای پێغەمبەری ئەکرد، وتم: بیکوژن.

کابرای خوا وتی: چاکت کرد من هیچ ئاگام لە ناردنی ئەو نەبووە!.

٥٤. هەروەها یەکێکی تریش پەیدا بوو داوای پێغەمبەری ئەکرد، ئەویشیان گرت و بردیانە لای خەلیفە. خەلیفە وتی: تۆ پێغەمبەریت؟ وتی: بەڵێ. وتی: موعجزەت چییە؟ وتی: موعجزەیەکی زۆر ئاشکرام هەیە. خەلیفە دڵی ڕاچەنی وتی: چییە؟ وتی: ئەوەیە کە ئەزانم چیتان لە دڵایە. وتی: چییە؟ وتی: ئەوەیە کە هەمووتان ئێستە ئەڵێن: من درۆ ئەکەم!. خەلیفە دەستی کرد بە پێکەنین و بەرەڵای کرد!.

٥٥. جارێکی تر کابرایەکی تر داوای پێغەمبەریەتی کرد گرتیان و بردیانە لای خەلیفە، خەلیفە وتی: ئەمە لە برسا شێت بووە و لە چڵکا هار بووە. بیبەن لە ئاشخانەی بارەگا بیگرنە گۆشت و ڕۆن و بیبەنە حەمام بیشۆن و جلی پاك و پوختی لەبەر کەن چاك ئەبێتەوە. بردیان وەکوو خەلیفە وتی وایان لێ کرد!.

لە پاش ماوەیەك خەلیفە بانگی کردەوە پێی وت: ئێستەش جبرەئیل دێت بە لاتەوە؟ چیت بۆ دێنێ؟ وتی: بەڵێ. وتی: چییە؟ وتی: ئەڵێ شوێنێکی چاکت دەست کەوتووە هیچ پێغەمبەرێك هەرگیز ئەم خۆشی و ناز و نیعمەتەی دەست نەکەوتووە؛ نەکەی بەجێی بێڵیت. خەلیفە وتی: دە باشە دانیشە بۆ خۆت هەر بخۆ!.

٥٦. ئەم شارەزوورەی ئێستە ئەوسا هەمووی قامیشەڵان و چقڵ بوو، زۆر کەم ئاوەدانی تێدا هەبوو؛ بە تایبەتی لەبەر ئەوە کە ڕێبازی جاف بوو، ئاوەدانی هەڵنەئەگرت. لە نزیکی بێستانسوورەوە ڕووبارێ هەبوو لە «تەپی سەفا»وە [ڕێگایەك] بەسەر ڕووبارەکەدا ئەهات بۆ بێستانسوور.

«مار»ێك لەسەر ئەو ڕێگایەدا پەیدا بووبوو، ڕێگاکەی گرتبوو، نەیئەهێشت کەس بەو ڕێگایەدا هاتوچۆ بکا، تەنانەت سواری ئەگێڕایەوە دواوە. زیاتر لە دوو مانگ ئەو ڕێگایەی بردبۆوە بەست. بە ڕێکەوت جارێك دوو کەسی نەشارەزا بە حاڵی ئەو مارە، بەو ڕێگایەدا ئەڕۆن. مارەکە لەو کاتەدا لە چەقی ڕێگاکەی ئەوانا لەسەر ڕووبارەکە ئاو ئەخواتەوە. ئەو دوو کەسە بۆیان ڕێ ئەکەوێ مارەکە ئەکوژن.

لە ڕۆژی دواییدا لە بێستانسوور بڵاو ئەبێتەوە کە مارەکە کوژراوە. پیاوێك لە دێکەدا هەبوو «مینە»ی ناو بوو، کوڕوکاڵ سەریان ئەخستە سەری کە تۆ مارەکەت کوشتووە؟ ئەویش وتی: نەء. هەر وازیان لێ نەهێنا، ئاخرەکەی کابرا لە خۆی کەوتە شکەوە وتی: ئەو عالەمە هەموویان ئەڵێن: تۆ کوشتووتە، کەواتە ڕەنگبێ من کوشتبێتم. وتی: بەڵێ من کوشتوومە.

ئەمجا مینەیان هەڵگرت و چوون بۆ سەیری مار. مار، مار نەبوو، ئەژدەهایەك بوو. مینە کە چاوی بە مار کەوت بوردەوە! لە هۆش خۆی چوو. ماریش ئەوا تۆپیوە. بە هەر جۆر بوو مینەیان هێنایەوە هۆش خۆی. ئەویش بووبوو بە قسەی خۆیەوە هەر ئەیوت: من کوشتوومە!.

**٥٧.** دوو کتێب لەناو فەقیانا باوی هەبوو ئەخوێنرا، یەکێکیان «عَوامِل»ـیان پێ ئەوت؛ ئەوی تریان «جَمعُ الجَوامِع». ئەو کەسەی کە سەرەتا ئەچووە فەقێتی دەستی ئەکرد بە عەوامل و ئەوەی ئەخوێند. ئەوەش کە لە فەقێتی ئەبووەوە هەموو عیلمەکانی ئەخوێند دەستی ئەکرد بە «جمع الجوامع». مەعنای وایە ئەم دوو کتێبە تەقریبەن ئەمسەر و ئەوسەری خوێندنی فەقێتییە.

شێخ عەلی پەڕۆ هەبوو لە سولەیمانی، مەلایەکی وا نەبوو، شێخ بابەعەلی

تەکیەیی هەموو جار ئەیوت: شێخ عەلی «عوامل» و «جمع الجوامع» وەکوو یەك ئەزانێ. شێخ عەلی ئەمەی پێ خۆش بوو؛ یەعنێ چۆن عەواملی بەلاوە ئاسانە بۆ زانینەکەی، جەمعولجەوامعیشی بەلاوە ئاوایە و بە باشی ئەیزانێ، لەگەڵ ئەوەشا مەبەستی شێخ بابەعەلی ئەوە نەبوو. مەبەستی ئەوە بوو کە چۆن عەوامل بەو ئاسانییە نایزانێ، جەمعولجەوامعیش هەروەها نازانێ. لە نەزانینیانا هەروەکوو یەك وایە.

٥٨. شێخ بابەعەلی تەکیەیی زیاتر لە هەشتا ساڵ عومری کردبوو، یەکێك بوو لە عالمە هەرە گەورەکانی سولەیمانی. لە بن دەست ئەمەشەوە لە نوکتە و قسەی نەستەقدا هەر یەکێك بوو لە نوکتە بێژەکانی سولەیمانی.

جارێکیان وتی: ئێوە وا ئەزانن کە من پیر بووم و گوڕی زەمانی جوانیم نەماوە. وتیان: چۆن یاشێخ؟ وتی: ئێمە لە تەکیە لە تەنیشت ماڵەکەمانەوە بەردێکی گەورە هەبوو، ئەو سەردەمە کە مناڵ بووم دەستم دایە، بۆم نە ئەجووڵا. کە بووم بە گەنج و هەڕەتی هەرزەکاری هەر دەستم دایە بۆم نەجووڵا. ئێستە کە ئێوە ئەڵێن پیر بووم هەر دەستی ئەدەمێ، کەچی دیسان بۆم ناجووڵێ! کەواتە دەوری مناڵی و گەنجی و پیریم هەروەکوو یەك وایە و هیچ فەرقی نەکردووە!.

٥٩. شێخ ڕەزای تاڵەبانی لەگەڵ وەسمان پاشای جافدا سەروسەودای هەبوو. هەموو جار هاتوچۆی ئەکرد. هەروەها لەگەڵ خانمی وەسمان پاشاشا ئەو ناسراوییەی هەبوو. ڕۆژێك شێخ ڕەزا بە وەسمان پاشا ئەڵێ: پاشا تۆ ئەرکێکی زۆری عەشیرەتی جافت بە سەرەوەیە، ئەم عەشرەتە گەورەیە ئیدارەی ئەوێ، ئەم دیواخان و دەواری دوانزە هەستوونییە

ئیدارەیەکی تری ئەوێ. تۆ خۆتت کەنار گرتووە، خانم ئیدارەی عەشرەتەکە ئەکا. حەقیقەت سەروکاری دیواخان و میوان و میوانداریش ئەکا، بەڵام ئەمە بۆ ئەو ئەرکێکە زیاد لە تاقەت، خواش قەبووڵی نییە. خانەدان و بنەماڵەی بەناوبانگ زۆرە لەم کوردەوارییە، ئەتوانی ژنێکی‌تر لە یەکێك لەو خانەدانانە بێنیت، ئەو سەروکاری دیواخان و میوانان بکا؛ خانمیش یەکچاو ببێتەوە بۆ عەشرەتدارییەکە و ئیدارەی ئەم تۆپی جافە. شێخ بەم جۆرە دڵی وەسمان‌پاشا کرمێ ئەکا.

ئەم قسەیە ئەگاتەوە بە خانم. خانم لە شێخ ڕەزا تووڕە ئەبێت و ئەنێرێ ئەیهێنن. پێی ئەڵێ: شێخ ڕەزا تۆ چۆن قسەی وات لەلای پاشا کردووە؟ گوایە من کە عادلە بم و لە بنەماڵە گەورەکانی سنە بم وەکوو ئیدارەی عەشرەتداریم پێ ئەکرێ، ئیدارەی دیواخان و میوانداریم پێ ناکرێ؟!

شێخ ڕەزا ئەڵێ: خانم، من قسەی وام نەکردووە و بە درۆ ئەمەیان بۆ هەڵبەستووم. خانم ئەڵێ: چۆن؟ لەوانەیە من ئەمەم لە ناوچاو پاشاشەوە خوێندۆتەوە. شێخ ڕەزا ئەڵێ: ئەمەی پێ ناوێ، لەگەڵ پاشادا ڕووبەڕوومان بکەرەوە، ئەگەر من قسەی وام کردبوو ئەو وەختە تۆ هەقی گلەییت هەیە و ئەتوانی ئەوی لە دەستت دێ بەرانبەر بە من بیکەی. خانم ئەڵێ: باشە.

خانم بۆ سبەینێ کۆڕێکی سێ قۆڵی بۆ خۆی و شێخ ڕەزا و وەسمان‌پاشا ڕێك ئەخا و سێ بە سێ دائەنیشن. خانم ئەڵێ: شێخ ڕەزا ئەوە تۆ و ئەوە وەسمان‌پاشا، فەرموو قسەکانی خۆت بگێڕەوە. ئەڵێ: قسەی چی؟ ئەڵێ: ئەو قسانە کە هانی پاشا ئەدەی ژنی‌تر بێنێ. ئەڵێ: خانم ژنی‌تری چی؟ ئەوا پاشا خۆی بە ڕووەوەیە و ئەوا تۆیش دانیشتووی، پاشا، وەکوو لە ناوچاویا خوێندبوومەوە: [وای خەیاڵە] لەبەر ئەوە کە تۆ ئەرکێکی زۆرت بە سەرەوەیە، ژنێکی‌تر بێنێ؛ ئەو خەریکی دیواخان و

میوانداری بێ، تۆیش سەروکاری عەشرەتەکە بکەی. منیش وتم: پاشا شتی وا مەکە، هەوێ لە بەینی یەکا ڕێ ناکەون. ئەوی بە خانم ئەکرێ بە کەسی‌تر ناکرێ، ئەگەر ژنێکی‌تر دێنیت وەکوو تۆپی منداڵانت لێ دێ بە دەستیانەوە؛ ئەو فڕێت ئەدا بۆ ئەو، ئەو بۆ ئەو. ئەگەر دوو ژنی‌تر دێنیت وەکوو مەنجەڵی سێ کوچکەی ئاگردانت لێ دێ، هەر ئەبێ دەست بکەی بە کوڵان و جۆشدان بە سەریانەوە و هیچیشت لە دەست نایە. ئەگەر سێ ژنی‌تر دێنیت، وەکوو چوار گوریسی دەوارت لێ دێت، هەریەکە بە لایەکا ڕات‌ئەکێشن و تۆیش لەو ناوەدا پرزەت ئەبڕێت. خانم من ئەمەم وتووە!.

خانم ڕەنگێکی سوور و گەشی هەڵێنایەوە و هەر لەو وەختەدا بانگی کرد خەڵاتێکی باشیان بۆ شێخ ڕەزا هێنا و وتی: لە بڕوێش و کەشک و دوێنەش بارکەن با شێخ ڕەزا بینێرێتەوە بۆ مناڵەکانی، وتی: یا شێخ! هەموو جار هەر قسەی وا بکە. وتی: چۆنی ناکەم خانم. ئەمە لەم‌لاوە خانم وا، لەولاوە وەسمان‌پاشا ڕەنگ لە ڕوویا پەڕی وتی: خوا بتگرێ شێخ ڕەزا، تۆ کەی بەلای منەوە وات وت؟ تۆ خۆتت ڕزگار کرد و منت تووش کرد. شێخ ڕەزا وتی: وەسمان‌پاشا تۆ هیچت لە دەست نابێتەوە هەموو شت هەر لایقی خانمە. بەخوا سا هەموو جار هەر قسەی وای بۆ ئەکەم جا تۆیش کەیفی خۆتە!.

٦٠. ساڵی (١٩٢٣) «سید عبدالعزیز شیخ الإسلامی» سنە، سەرهەنگ ئەحمەدخانێکی حاکمی ئەو وڵاتە دووری ئەخاتەوە و ئەینێرێ بۆ هەمەدان. ئەگاتە «قڕوە» لەم‌لاوە بۆی تێ‌ئەکەون، ئەو دوور خستنەوەیە لا ئەبرێ و شێخولئیسلام ئەگەڕێتەوە بۆ سنە. مەلا فەیزوڵڵایەك

هەبوو شاعیر بوو، شیعری بۆ پیاوە گەورەکان دائەنا، شتیان ئەدایە.

بەهۆی گەڕانەوەی شێخولئیسلام؛ پارچە شیعرێکی فارسی سەرسەلامەتی شێخولئیسلام و گەڕانەوەی دائەنێ و ئەچێ لە دیوەخانا بۆی ئەخوێنێتەوە. مەفهوومی شیعرەکانی ئەوە ئەبێ:

«لە پاش سەر سەلامەتیت، نەزرم کردووە لەسەر خۆم کە تۆ قسەی خۆشم لەگەڵا بکەیت و بەهۆی گەڕانەوەشت زیافەتێك بکەی بۆ ئەو عالەمە و منیش بانگ کەیت. ئاغەی «نظام الإسلام» هەموو جار قسەی خۆشم لەگەڵ ئەکات و ئەمدوێنێ، تۆ ئەوەشت نییە!».

ئەمجا شێخولئیسلام دەست ئەکا بە قسەکردن لەگەڵیا ئەڵێ: «مەلا فەیزوڵڵا فرە خاسی شوکر، ئەحواڵتان چۆنە، ئەوە بۆچە سەرمان لێ نادەیت؟ من گجارێ تۆم بە دڵا تێت، خۆشتم گەرەکە، حەز ئەکەم جارجار دەرکەفیت». مەلا فەیزوڵڵا ئەڵێ: «شا شا، ئەوەی پووڵی تێ ناچێ ئەیکا، وەلێ ئەوەی پووڵی تێ ئەچێ ناکەفێتە قەرەی!». شێخولئیسلام و دانیشتوانی مەجلیس هەموو دەست ئەکەن بە پێکەنین.

شێخولئیسلام ئەڵێ: نەزرەکەی تریچت ئەکەین، هەر لەوێدا ئەمر ئەکا پارەیەکی باشی ئەدەنێ. دەعوەتێکی گەورەش ئەکا و مەلا فەیزوڵڵاش ئەچێتە ناویەوە ئەڵێ: «ئاغەی شێخولئیسلام ئاوا ئەوێ!».

٦١. پیاوێك ئەچێتە لای مەلا عەبدوڵڵای بێژوێ ئەڵێ: مامۆستا بەڕۆژوو بووم، چوومەوە بۆماڵەوە؛ مناڵەکان «بەڕوو»یان ئەبرژاند، نەفسم بۆی چوو، دەستم برد دەنکێکم هەڵگرت خواردم؛ ئێستە چی بکەم؟ وتی: بابم ڕۆژێکی‌تر لە باتی بگرەوە. وتی: منیش ئەوەم کرد، بەڵام چوومەوە بۆ ماڵەوە مناڵەکان «کرۆسك»ـیان هێنا بوو، دڵم لێ چوو

دەستم برد دەنکێکم لێ خوارد. وتی: ڕۆژێکی‌تر لەباتی ئەو ڕۆژە بگرەوە. وتی: بەڵێ، بەڕۆژوو بوومەوە، بەڵام چوومەوە بۆماڵەوە منداڵەکان «گیز»ی قەشانیان هێنابوو، دەستم برد دەنکێکم لێی خوارد. مەلا عەبدوڵڵا ئیتر ئاگری گرت و وتی:

بابم من وا بە باش دەزانم بەڕۆژوو نەبیت تا دەستانت وەکوو کەران دەبەستنەوە ئەیخەنە ملت. هەندێ قوزلقورتیش دەکەن بە دەمێتەوە، جا ئەو وەختەی بەڕۆژوو بە و چاوت دەردێت!.

٦٢. پیاوێك لەو سەرە تاریکەشەو بوو؛ ڕێبوار بوو، سەری لێ شێوا و ڕێگای لێ تێك چوو، پاشان مانگ هەڵاتبوو، بە مانگەشەو ڕێگاکەی دۆزییەوە. ئەمجا ڕووی کردە مانگەکە و وتی: نازانم چی بڵێم؟ ئەگەر ئەڵێم: خوا نوورانیت کا، نورانیت! ئەگەر ئەڵێم: خوا جوانت‌کا، جوانیت! ئەگەر ئەڵێم: خوا عومرت درێژکا، عومرت درێژە!. کەواتە هەر ئەوە ئەڵێم: «ئەی لە دەورت گەڕێم خەپلەی ئاسمان!».

٦٣. لە ڕاوێژی زمانی عەرەبیدا هەندێ شت هەیە نە نێرە، نە مێیە، نە نێرەمووکە؛ کەچی بە ناوی «مێ»ـشەوە بیستراوە. وەکوو «أرض، قوس، أرنب، نار»، وە زۆر شتی‌تریش. ناچار بەمانەیان وتووە: «مُؤنّث»ی «سَماعی». ئەم جۆرە ڕاوێژە لە زمانی کوردیدا نییە.

بەڵام ڕەحمەتییەکە لەم ڕووەوە شتێکی ئەفەرموو، ئەیفەرموو: ئەو پیاوەی کە لە سەر قسەی ژن بجووڵێتەوە و هەر بە قسەی ئەو بکا، ئەوە ئەو پیاوە لە زمانی کوردیدا پێی ئەڵێن: «مُؤنّث»ی «سَماعی». هەروەها ژنێکیش کە سواری قسەی خۆی بێ و هیچ بەگوێ مێردەکەی نەکا، ئەوە ئەو ژنەش لە زمانی کوردیدا پێی ئەڵێن: «مُذكّر»ی «سَماعی».

٦٤. ڕەحمەتییەکە فەرهەنگێکی هەبوو، لەو فەرهەنگەیا گەلێ شتی باس کردبوو، ڕشتەی مرواری قەیدی چییە با باسی هەندێکی بکا، خۆ قوفڵی کەعبە کەچ نابێ؛ ئەفەرمووێ:

«قِران النَّحْسَیْن»: ئەوەیە کە دوو سەرخۆشی ڕیشدار ماچی یەکتر بکەن.

«عەربەدە»: نوێژێکە لە گۆڕی سەرخۆشانا بکرێ.

«پاڵەوان»: ئاقڵێکە لەناو سەرخۆشانا دابنیشێ.

«بەرات»: ئەوەیە کە لە وەختی سەرخۆشیدا وەعدەی پێ بدا، بەڵام کە هاتەوە هۆش خۆی، نەیدا و پەشیمان ببێتەوە.

«فزوول»: ئەو کەسەیە کە لای دامە و تاوڵە [دانیشێ] و یەکێ لە دوو کەسەکە فێر ئەکا.

«زولقەرنەین»: ئەوەیە کە دوو ژنی هەبێ.

«مودەببر»: ئەو کەسەیە کە مەساریفی لە دەرامەتی زیاتر بێ.

«ڕیش»: تەزبێحی دەستی ئەو کەسانەیە کە ئەچنە دەرباری فیکرەوە.

«ڕووڕەش»: ئەو کەسەیە کە یەکەمجار تووشی یارەکەی ئەبێ و حەیتەکەی لووت بەرز ناکاتەوە.

«ماڵ‌وێران»: ئەو کەسەیە کە ژنی دەستەمۆی لە ماڵا هەبێ.

«بازاڕی»: وەستای جنێو.

«هۆنەر»: قسە دز.

«موعجزە»: ئەو کەسەیە کە لەلای دامە و شەترەنج و شتە دائەنیشێ ڕاستییەکەی ئەزانێ، نایڵێ.

«اِلتِقاء السّاكِنَين»: دوو فەقێن لە حوجرەیەکدا.

«ڕەمەزان»: بە هیوای بەهەشت چوونە ناو جەحەنەمەوە.

«سوێن»: پێخۆری درۆ.

«عەزرەفووت»: ئەو کەسەیە شیعری خۆی ئەخوێنێتەوە، سەری بۆ ئەلەقێنێ.

«ڕاستگۆ»: دوژمنی هەموو کەس.

«بێ‌گوناح»: ئەو کەسەیە کە کەوتبێتە ژێر دەستی سەرتاشی ناشییەوە.

«نادر»: ژنێکە کە قسەی بە ڕێ و جێ بکا.

«بەدبەخت»: جوانێکە کە ژنی پیری هەبێ.

«بێوڵەت»: پیرێکە کە ژنی جوانی هەبێ.

«زەبانیە»: سەرتاشی ڕیشدار.

«زەقووم»: ئەو پارەیەیە کە ئەیدەیتێ.

«مەلا»: عیزرائیلی مناڵان.

«دیق و دەرد»: هاوڕێی خراپ.

«بەرگدرووی چاك»: ئەو بەرگ درووەیە کە جلەکە بە ئەندازە نەدوورێت.

«تەوقی لەعنەت»: ئەو زاوایەیە کە هەر لە ماڵا بێت.

«زیرەکی تەواو»: ئەو کەسەیە کە شیعر بنووسێتەوە و بیخوێنێتەوە و هیچی لێ تێ نەگا.

«داماو»: پیرێژنێکە کەسێك بۆ ئیشێکی خێر لای لێ نەکاتەوە.

«نمایشگا»: کۆڕی سەرخۆشان.

«خەناق»: میوانی دایمی.

«نوستن»: زڵیا و پڵیاوی هەژاران.

«خرخاڵ»: ئەنگوستیلەی پێ.

«دوعای خێر»: ئیحسانی هەرزان.

«ژێرکراس»: مەحرەمی دایمی.

«ئومێد»: کەشکۆڵی بێ‌نەوایان.

«شەونم»: فرمێسکی چاوی شەو.

«مامان»: دەرکەوانی دوابڕاوەکە.

«چاو»: دەروازەی دڵ.

«حاجی‌لەقلەق»: ماڵاوایی زستان.

«گۆڕەوشار»: بن‌دەستی پیرێژن.

«بانگبێژ»: جارچی خوا؛ دوژمنی خەو.

«پشتمل‌پان»: گێل. (وریا بە دەست نەبەی بۆ پشت ملی خۆت!).



# لە باخێ گوڵێک

٦٥. مەلا هەمزەی کوڕی محەمەد، سەرەتا لە گوندی «دەمەرقوس» هاتۆتە دنیاوە. ئەم گوندە [سەر بە] قەزای شاخی حەکاری وڵاتی «نۆدێز»ە و لە عەشرەتی خانی لە «لوا»ی «وان» لە وڵاتی تورکیادایە.

ئەم پیاوە یەکێك بووە لە زانا پایەبەرزەکانی ئەو وڵاتە. هەموو وڵاتی کوردەواری بە سۆران و بۆتانەوە لەو سنوورانەدا گەڕاوە بۆ خوێندن و لە گوڵی زانایی هەر مزگەوت و هەر عالمێك شیرەیەکی شیرینی وەرگرتووە. جگە لە پایەی زانایی ئاینییەکەی شارەزایەکی تەواوی هەیە لە بارەی کورد و عەشایری کوردەوە. لە شێوەی سۆرانیدا بە پۆختی قسە ئەکا و ئیمام و خەتیب و مودەڕڕیسە لە یەکێ لە مزگەوتە ئەهلییەکانی ناو شاری زاخۆ. دوو کوڕی هەیە. ئەم کاتە تەمەنی لە دەوری هەشتا ساڵێدا ئەبوو.

لە ڕۆژی ١٩٧٣/٨/٣ لە ژێر خێوەتەکەدا لە حاجی هۆمەران پێکەوە دانیشتبووین، گەلێ سەرگوزەشتی ڕابوردووی بۆ گێڕامەوە. یەکێك لەوانە ئەم کارەساتەی خوارەوەیە کە بەرانبەر بە ڕەوڕەوەی مێژوو ڕێکەوتێکی سەیرە. وتی:

لەو گوندی دەمەرقوسە بنەماڵەیەك هەیە بە میراتی بە تەمەن درێژی هاتوون. پیاوێك هەیە «میرخان»ی ناوە، ژنێکی هەیە «عەجە»ی ناوە (نازانم ئێستە ماون یا نەماون، چونکە زۆر لە مێژە من لەوێ دەرچووم). ئەمانە نەتەوە و بەرەیەکی زۆریان لێ کەوتۆتە؛ ئەتوانم بڵێم تەنیا ئەوان

بوون بە گوندێکی سەربەخۆ. عەجە دەستنوێژیی لە ٢١ کەس لەوانە ناشکێ. ئەو سەردەمە کە من چاوم پێیان کەوتبوو هەموو مابوون ئەمانەش بەم جۆرە.

دوویان باوك و باپیری مێردەکەی، دوو کوڕی خۆی، چوار زاوا، دوویان مێردی، دوو کچی مێردەکەی خۆی بوون کە لە ژنیتر بووبوون. دووشیان کوڕی زڕ کوڕەکانی بوون، دووشیان یەکێکیان کوڕی کوڕەکەی بوو، یەکێکیان کوڕی کچەکەی، شەش کوڕ و خوشکەزای شیری، سێ لەمانە خۆی شیری دابوونێ، سێکەیتریان ژنی پێشووی مێردەکەی (میرخان) شیری دابوونێ، کە ئەو ژنە و ئەم (واتە عەجە) خوشکی شیری یەك بوون. یەعنی [ژنی] پیاوێك شیری دابوو بەمانە.

مەلا هەمزە وتی: ئەمانە هەموو مابوون و پیاو بوون تا ئەم شوێنە ئاگاداریەکەی مەلا هەمزە بوو. منیش بەم هۆیەوە شتێکی مێژووییم کەوتەوە بیر، هەرچەندە ئاشنایەتی بە کوردەوە نییە، بەڵام شتێکی مێژوویی و عاجباتیە بۆ زانیاری بێکەڵك نییە. ئەوەندە هەیە من هی «عەجە»م بەلاوە ڕووداوێکی سەیرترە! ئەوەش ئەوەیە کە:

«عاتکە»ی کچی یەزیدی کوڕی موعاویەی کوڕی ئەبیسوفیان دایکی یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان بوو. لە یەك کاتا حەرام بوو لە یانزە کەس لە خەلیفەکانی ئومەوی کە ئەو یانزە کەسەی لە ژیانیا چاوپێکەوت ئەوانیش:

١- یەزیدی باوکی ٢- موعاویەی باپیری ٣- مەروانی باوکی عەبدولمەلك (کە ئەم ژنی عەبدولمەلیك بوو و مەروان ئەبێ بە خەزووری) ٤- وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك ٥- سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك ٦- هوشامی کوڕی عەبدولمەلیك (کە ئەم سێیە هەنەزای بوون) ٧- وەلیدی کوڕی

یەزیدی کوڕی خۆی( کە وەلید ئەبێتە کوڕەزای) ٨- یەزیدی کوڕی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك ٩ـ ئیبراهیمی کوڕی مەروانی کوڕی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك (کە ئەم ئیبراهیمەش کوڕی هەنەزای بوو) ١٠ ـ یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك (کە ئەم یەزیدە کوڕی خۆی بوو) ١١- موعاویەی برای خۆی کە ئەکاتە موعاویەی کوڕی ئەبی‌سفیان.

لەمەوە ئەوە دەرئەکەوێ کە عاتکە خەلافەتی دوانزە کەسی لە ئومەوی دیوە. یەکێکیان کە عەبدولمەلیك کوڕی مەروانە، مێردی خۆی بووە و ئەوانی‌تر بەهۆی نەسەب و ژن و ژن‌خوازییەوە لێی حەرام بوون و دەستنوێژی لێیان نەشکاوە.

٦٦. ژنێك کچێکی هەبوو، مێردی کرد. ئەو شەوە کە بیگوێزنەوە ئەو قسانەی لەگەڵ کرد وتی: کچم ئەوماڵەی کە چاوت تیایا پشکووت، کە بە ناز لە ناویا گەورە بوویت، کە بە تیلی خۆشویستنی باوك و دایك گەشکەت ئەکرد، ئەوا ئێستە بەجێی دێڵیت. ئەبی بە هاوسەری کەسێك، دوور نییە تا ئێستا یەکترتان نەدیبێت؛ هۆگریتان پێکەوە نەبووبێت؛ ئەبی بە هاوسەری یەکێك کە پێکەوە ڕانەهاتوون. ئەبێ ببی بە کارەکەرێك بۆی تا ئەویش ببێ بە خزمەتکارێك بۆت. ئەچیتە ماڵێك نە دەنگی باوکی تێدایە نە هی دایك، بە پارێزەوە پێی تیا دائەنی. هەر هەنگاوێکت سڵەماندنەوەیەکە.

کچم ئەگەر بتەوێ لەم ژیانە تازەیەتدا بەرخوردار بیت، ئەم ئامۆژگارییانەی من بکە بە گوارەی گوێت، بۆ ئەوە هەموو ئەو ژیانە تازەیەت وەکوو گوڵی تازەی بەهار گەش و تێراو بێت:

بە قنیات بە، چیت هاتە بەر دەست پێی ڕازی بە، کە مێردت هاتەوە

بە ڕوویێکی خۆشەوە بچۆ بە پیریەوە، ئەگەر شتێکی هێنایەوە و دای بە دەستتەوە ـ با کەمیش بێ ـ وای لێ وەربگرە و بە جۆرێ لە ڕووی ئەوا پێیت خۆش بێ، کە تۆ هەرگیز شتی وا خۆش و جوانت نەدیوە. با لە ماڵی باوکیشتا ئەو شتەت زۆر دیبێ، قسەی لە گوێ بگرە و چەلەحانێی لەگەڵ مەکە.

سەیری ئەو شوێنە بکە کە ئەو سەیری ئەکا، ئاگاداری ئەو شوێنە بە کە ئەو بۆنی ئەکا؛ چونکە ئەو شوێنە ئەگەر پیسوپوخڵ بوو، تۆی لە بەرچاو ئەکەوێ، ئەگەر بۆنی ناخۆشی کرد لووتت پیا نایەنێ، پیاو حەز لە شوێنی پاك و خۆش ئەکا. ئاگاداری وەختی خواردن و نوستنی بە، لە وەختی خۆیا نانی بۆ دانێ و لە وەختی خۆیا بینوێنە؛ چونکە برسێتی نانی هاری بە دەمەوەیە و بێ خەوی ئاگری تووڕەیی و غەزەبی تیژ ئەکا.

ئاگاداری ماڵی بە و ئاگاداری منالی بە. کە ماڵیت بە خۆڕایی دۆڕاند، خۆت بێ ماڵ ئەبیت. کە بێئاگا بووی لە منالی، «وقار» و سەنگینی ئەو پیاوە نامێنێ؛ کە هی ئەو نەما، تۆ سووك ئەبیت. پەروەردەی منال بە دەست دایکە نە باوك. بێقسەیی مەکە. نهێنییەکی کە هەبوو ئاشکرای مەکە؛ چونکە ئەگەر بێقسەیی بکەی ئەوجا دڵی لێت پڕ ئەبێ. ئەگەر نهێنییەکەی ئاشکرا بکەی ئەمین مەبە لەوە کە تۆڵەت لێ نەکاتەوە. خۆشی و ناخۆشی ئەو و خۆت هەردووکی کلیلەکەی لە دەست تۆدایە.

٦٧. پیاوێکیش ئامۆژگاری کوڕەکەی ئەکرد پێی وت: ڕۆڵە! کە ویستت ژن بێنیت زوو بیهێنە با پێکەوە پیر ببن و منالیشتان ببێ بە سوار لە دواتانەوە. تۆ پیر و ئەو جوان لە ئاخر عومرا ڕێ ناکەون. خزم باشترە لە بێگانە. هەموو جار قسەی خۆشی لەگەڵا بکە. بیروڕای

وەربگرە مەرجیش نییە بەگوێی بکەی. لە بەرچاوی خەڵکەوە بە دەمی پێکەنین و بە چاوی بەرزەوە سەیری بکە.

ئەو ژنەی کە ئەیهێنی ئەگەر لە عومری شانزە تا بیستوچوار بوو زیاد لە ئەندازە مەچۆرە لای؛ چونکە ڕەنگبێ تۆ لە هەوەڵەوە برسی بیت ئاگات لە خۆت نەبێ، بەڵام لە پاش ماوەیەك تۆ وا نامێنیت و بۆت تێر ناکرێ. ئەویش بە ئاوەدانێکیتر فێر بووە لەوانەیە بۆت زەوت نەکرێ، ئیشی وا بکا ئابڕووی هەردوو لاتان بڕوا. هەر جارە کە شتێك ئەبینی بۆی بێنە و بە ڕوویەکی خۆشەوە بیدەرێ، بڵێ: ئەمەم بۆ تۆ و لەبەر تۆ هێناوە.

.٦٨ مەلا تۆفیقی عەتار ئامۆژگاری حەمەی کوڕی خۆی ئەکرد ئەیوت: ڕۆڵە! خواردن مەکە بەسەر خواردنا، بە ڕۆیشتنا کە هیلاك بوویت دانیشە. بە تێری مەچۆرە حەمام. مەچۆرە لای پیرێژن. لەسەر تێری مەچۆرە لای ژن. هیچ نەبێ حەفتەیەك جارێك بە ڕشانەوە «معدە»ی خۆت پاك بکەرەوە. مێوە تا نەگات مەیخۆ. باستورمە زۆر مەخۆ. کە نیوەڕۆژەت کرد بەسەریا بخەوە. کە شێوت کرد بە سەریا بگەڕێ. کە نوستی بەسەر لای چەپا بخەوە. زیاتر لە شەو بەسەر لای ڕاستا مەخەوە. تا برسیت نەبێ نان مەخۆ. کە هێشتا دڵت ئەبا دەست بگرەوە. کە تێرت لە شتێك خوارد، شوێن چاوت مەکەوە کە پێت ئەڵێ: ئەوەشی هەر لێ بخۆ؛ واتە چاوت دڵی لەو شتە ئەچێ. بە شەو کە ویستت بنوی لە پێشا بچۆرە سەر ئاودەست، ئیشت بەو چوونە هەبێ یا نەبێ. شتی گەرم مەخۆ. ماست و ماستاو زۆر بە کەڵکە بۆ لەش. دەستوور (حوقنە) بۆ لەش وەکوو ئاو وایە بۆ دار.

◈◇◈

## بۆ قازییەکان

٦٩. بەو پیری شەوکێڵە هەرکامێکتان نەیزانن لە قازیەتیتان ئەخەم؛ جا وریای خۆتان بن.

دوو پیاو هەریەکەیان دایکی ئەوی‌کەیانی هێنا، وە هەریەکە لەو ژنانە کوڕێکیان بوو، ئەم کوڕانە ئەبن بە چی یەك؟

## بۆ مێژوو

٧٠. یەکەم کەس لە وڵاتی سۆراندا کە هۆنراوەی لە شێوەی هەورامییەوە خستە ناو شێوەی موکری «نالی» بوو.

٧١. یەکەم کەس کە مەقاماتی کوردی خستە سەر قەوانی «گرامافۆن» سەید عەلی‌ئەسغەری کوردستانی و پاشان کاوێساغای شەقڵاوا و حەمدیەفەنی چاپچی بوو لە سولەیمانی.

٧٢. یەکەم خانووێك کە لەسەر شێوەی تازە دروست کرا لە سولەیمانی ئەو خانووە بوو کە ماوەیەك کرا بە ئیدارەخانەی زانکۆی سولەیمانی. لە ساڵی (١٩٣٥) دەستی پێ‌کرا. پاش ئەو، ماڵی حاجی برایماغای خەفاف و ماڵی حاجی مەلاسەعیدی کەرکووکی‌زادە بوو. ئەمە بێجگە لە سەراکە کە لە سەردەمی مێجەرسۆندا دروستکراو نەخشەکەی لەگەڵ سەرای هەولێردا یەکێك بوو.

٧٣. یەکەم کەس ـ جگە لە مەعموورەکان ـ لە ئەهلیدا سەترە و پانتۆڵی لەبەر کرد لە سولەیمانی تۆفیق قەزاز بوو.

٧٤. یەکەم کەس لەناو مەلاکانا لە سولەیمانی کە فێستی سووری بە مێزەرەوە لە سەر نا، مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسووڵ بوو.

ئەمە ئەهلی و مەلاکان ئەڵێم، ئەگەینە حاجی مەلا سەعیدی مەبعووس پێشتر لە سەریا بوو.

٧٥. یەکەم کتێبێکی گەورەی کوردی کە چاپکرا و بە جزوبەندی فەننییەوە کەوتە بازاڕ، چاپی دووهەمی مێژووی ئەدەبی کوردی بوو کە لە ساڵی (١٩٥٢)دا دەرچوو.

٧٦. یەکەم «گەشتێك» کە بە کوردی نووسرابێ و چاپ کرابێ گەشتێك لە کوردستانی عەلائەددین سەججادی بوو کە لە ساڵی ١٩٥٦دا دەرچوو.

٧٧. یەکەم کتێب کە لە بارەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی (نەقدی ئەدەبی) بە کوردی لە چاپ دەرچوو بێت، کتێبی «نرخ شناسی» عەلائەددین سەججادی بووە کە لە ساڵی (١٩٦٩) چاپ کراوە. (ئەمە پروپاگەندە نییە، عەلائەدین سەججادی پێویستی بەوە نییە بەڵام ئەمە بۆ مێژووە).

## تەزبێح

٧٨. لە سەدەی یەکەمی کۆچییەوە تەزبێح لە «بێزەنتی»ـیەکانی ڕۆژهەڵاتەوە کەوتە ناو عەرەبەکانی سەرەتای ئیسلام و پاشان هەموو ئیسلامەکانەوە. پێشتریش لە هیندییەکانەوە کەوتۆتە ناو بێزەنتییەکانەوە، کە کەوتە ناو ئیسلامیشەوە، هەروا بە بێ‌نازی مایەوە، تەنانەت لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا زیاتر ژنان و پیاوانی پارێزگار بەکاریان ئەهێنا. پاش ئەوە وردە وردە لە هەموو وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاو بووەوە.

تەزبێحات بە سەرەتای داهاتنی ئیسلام و سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بە وردە بەرد ( چەو ) و ناوکی زەیتوون ئەکرا. کە تەزبێح بڵاو بووەوە، ئەم، شوێنی ئەوانی گرتەوە. لە کوردەواری خانەقاکانی نەقشبەندی هەر بەو وردە بەردانە زیکر ئەکەن، بەڵام تەکیەکانی قادری ئەو بەردانەیان گۆڕیوەتەوە بە تەزبێحی دەنك گەورەی سەدویەك دانەیی. لە خانەقاکانا ئەو وردە بەردانە کۆمەڵ کۆمەڵ دانراون هەر سوفییەك سەد دانەی لێ دێنێت و زیکری خۆی پێ ئەکا.

## کوورەی ڕۆژ

.٧٩ کوورەی ڕۆژ شتێکی خڕی وەکوو تۆپە بەناو خۆیا هەموو وەکوو پزیسکەی ئاگرە. ئەم پزیسکانە بە یەکا دێن و دەچن و ئەتەقێنەوە. لە هەر دەقیقەیەکا گەلێ ملیار تەقینەوە لەناو ئەو کوورەیەدا دروست ئەبێ. لەم پزیسکانە و لە تەقینەوەی ئەم پزیسکانە ئەو کوورە گەورە سووتێنەرە پەیدا بووە. خۆر ملیۆنێ جار لە زەوی گەورەترە، سێسەد هەزار جار لە ئەرز قورسترە.

ئەم کوورەیە درێژییەکەی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر-واتە قوترەکەی-هەشت سەدوشەست وپێنج هەزار میل دوورە. ئەو ئەستێرە هەرە بچووکانە کە ئێمە بە ئاستەم ئەیانبینین ئەوانە زۆر لەو کوورەی ڕۆژە گەورەترن. تۆ ئەزانی ئەستێرەی قوتب چەندە دوورە لە ئێمەوە؟ ئەستێرەی قوتب چوارسەدوشەست وپێنج ساڵ بە بڕینی تیشکی ڕۆژ لە ئێمەوە دوورە؛ واتە: کاتێ کە ڕووناکی لەم ئەستێرەوە سەر هەڵئەدا بە (٤٦٥) ساڵ ئەگا بە ئێمە بە مەرجێك لە هەر سانیەیەکدا سەدوهەشتاوشەش هەزار مایل ببڕێ، وە بڵاوبوونەوە و پەرە سەندنی ئەو ئەستێرەیە دووهەزاروپێنجسەد جار زیاتر و بەهێزترە لە بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی ڕووناکی کوورەی ڕۆژ.

**٨٠.** کورد، بە سروشت ڕەنگی سووری خۆش ئەوێ، پیرەمێرد ئەڵێ:

**من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ**
**مژدەی شــەفەقی لــێ دەرئەکەوێ**

بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە شتێکی سروشتییە. کورد خۆیشی هەستی پــێ نەکـردووە، ئەوەنـدە هەیە غەریـزەکەی ویـستوویەتی. ئـەو هێزە کە هێـزی بینینـە و لـە چاودایـە، واتـە ئـەو هێـزە کە شـت ئەبینـێ، کاتێ کە ڕووبەڕووی تێ ئەکا کە هەموو زەڕاتەکەی لە ئوێنی خۆی ئەکشێتەوە بە هەموویانەوە ڕوو ئەکەنە ئەو ڕەنگەسوورە. وەکوو بڵێیت ڕەنگە سوورەکە لە خۆیا کۆ بکاتەوە، بەپێچەوانەی ڕەنگی ڕەش و ڕەنگەکانی‌تر، ئەوان هێـزی بینینـی چاو تەنـگ ئەکەنەوە، نایەڵن ئەو نـوورە بە تەواوی بگاتە ناخی ڕەنگەکە. جا ئەمەیە فەلسەفەی ئەوە کە کورد بە غەریزە ڕەنگی سووری خۆش ئەوێ؛ ئەو غەریـزەیە ئەمەی دۆزییەوە.

**٨١.** کـورد ئەڵـێ: «پیـاو پارە پەیدا ئـەکا و ژن ئاگاداری ئەکا». ئەم قسـەیە لـە فەلسـەفەیەکی قووڵەوە هاتووە. ئەبـوا هەر وا بوایە، کەچـی ئێسـتە پێچەوانە بۆتەوە. بە مەرقـەدی کاکەحمەد پیاو پارە پەیدا ئەکا و ژن بە قوڕیا ئەبا!.

**٨٢.** سـەرینی نەرم و ڕەق لە کاتی نوستندا کار ئەکاتە سـەر خەو بینینی خۆش و ناخۆش. چونکە ژێر سەر کە ڕەق بوو دەماری سـەر کرژ ئەبێتەوە و وردە دەمارەکانی سـەر ئەوانیش توند ئەبنەوە. لەم ئێشە ئەو هەڵمەی کە لەناو مێشکەکەدا پەیوەندە بە هەست پۆشراوەکانەوە، جموجووڵەکەی لە عادەتی خۆیا نامێنێ، خەو بینینەکە بە شتێکی سامناک دەرئەکەوێ.

**٨٣.** ئەم سامانەی ئێمە وا ئەزانین چاومان لێیە و کەچی چاویشمان لێی نییە، زۆر سەیرە. هەر تەنیا قسەیەکی کورت لە ئەستێرەکانیەوە ئەکەین وا ئەزانین هەزاران ئەستێرەی تێدایە کەچی وا نییە؛ بەڵکوو تەنگی بە گەلێ ملیۆن هەڵچنیوە. ئەگەر واتزانی کەمی کردووە هیچ لێی ڕامەوەستە و بیبژێرە.

تیشکی ڕووناکی لە هەر سانیەیەکدا (١٨٦) هەزار مایل ئەبڕێ و تیشکی مانگ بە سانیەیەك ئەگا بە ئێمەی ڕمووزنی سەرزەوی. کە ئەرزەکەی ئێمە بە چاو ئەو ئەستێرانەوە ئەڵێی خڕنووکەیە!.

هی ڕۆژ بە هەشت دەقیقە، واتە بە (٤٨٠) سانیە. کەواتە دووری ڕۆژ لە ئێمە (٤٨٠) ئەوەندەی دووری مانگە. ئەگەر شەو و ڕۆژێك بیست‌وچوار سەعات وەیا (١٤٤٠) دەقیقە وە مانگێك (٣٠) ڕۆژ و ساڵێك (١٢) مانگ بێ، ڕووناکی ئەستێرەی قوتب بە (٤٨٦) ساڵ ئەگا بە ئێمە!.

ئەستێرەیەکی‌تر هەیە لەو سەرە ئێمە پێی ئەڵێن «ژنەتاوسە». ڕووناکییەکەی بە دوو ملیۆن ساڵ ئەمانگاتێ. ماشائەڵڵا لە ئیشی خوا! لەم ئاسمانەدا وەیا بڵێین لەم بۆشایی دوایی نەهاتووەی ئاسمانەدا بە ملیارد ئەستێرە هەیە کە گەلێ ملیارد ساڵی ئەوێ تا ڕووناکییەکەیان بگا بە ئێمە. ئەگەر بڕوا ناکەی گوریسێك بگرە بە دەستەوە بە تیشکی ئەستێرەکەدا هەڵزنێ تا ئەگەیتە ئەوسەر، لەولاوە بە گوریسەکە وردەوردە بیپێوە تا ئەگەیتە ئەم سەر.

لەم گەڕانەتا بەناو ئەستێرەکانا تووشی فرە شتی سەیرسەیر ئەبی. ئەو وەختە دێیتە سەر ئەوە کە تەنیا ئەرز جێگای ئادەمیزاد و گیانلەبەر نییە، بەڵکوو لە هەندێ لەوانا گەلێ زیاتر هەیە و ئەوان ڕشخەن بە ئێمە ئەکەن؛ ـ ئێمەی ئادەمیزاد ـ پەککوو لە وی عەلامەتێ.

٨٤. لەناو کورددا لە خۆڕایی ئەم قسەیە بڵاو نەبۆتەوە کە ئەڵێ: «بونگووسە باڵا و چل گەزە ڕیشە».

«لوێس کۆلون» لە فەرەنسا کە (٧٨) ساڵ عومری بوو، وە لە ساڵی (١٩٠٤)دا تۆ خۆش، تەنیا ڕیشەکەی سێ مەتر و نیو بوو. وەکوو چۆن جاران پادشا و کەشیشەکان داوێنی جوبەکانیان لە دواوە خولامەکان بۆیان هەڵئەگرتن، «لوێس کۆلون»یش لە پێشەوە ئەبوا یەکێك داوێنی ڕیشەکەی کلافە بکردایە و بیگرتایە بە دەستیەوە بۆ ئەوە نەڕژێتە سەر ئەرزەکەوە.

٨٥. توخوا برا ئەگەر نەتزانیوە بیزانە: هەر تاقە زەلامێك تۆ بیگری، بە جۆرێکی ئیعتیادی لە ماوەی (٧٨) ساڵدا (٦٦٦) ملیۆن جار هەناسەئەدا. ئەگەر بڕوا ناکەی لە خۆتا تاقی بکەرەوە کە بە یەك دەقیقە شانزە جار هەناسە ئەدەیت، وەیا چکێ بچۆ بەولاترەوە لە سەعاتێکا هەزار هەناسە ئەدەیت.

٨٦. ئەزانی ئەگەر لە کاتی پژمینا مرۆڤ چاوی نەنووقێنێ دەست ئەکا بە تڕ کەندن. سا بەخوا برا چاو بنووقێنێ و نەنووقێنێ هەر ئەبێ بینووقێنێ؛ چونکە پژمینی بێ چاو نووقاندن هەر نابێ. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دەماری ناو بۆڕیەی «سی» و گەروو بە تەوژمی پژمینەکە کووڕ ئەبێتەوە. ئەو دەمارە چووەتە ناو پێڵووەکانی چاویشەوە، بەو هۆیەوە پێڵووەکان گرژ ئەبنەوە و چاوەکە ئەنووقێ.

٨٧. توخوا ئەمە مۆجزە نییە؟: مناڵی شیرەخۆر ئەتوانێ لەگەڵ شیر خواردنەکەدا هەناسەش بدا پێکەوە. کەچی گەورە ئەمەی پێ ناکرێ!.

٨٨. ئەزانی هەر تاقە عینسانێك ئەوەندەی ئاسنی تێدایە کە بزمارێکی پێ دروست بکرێ. کوڕە بێجگە لەمەش ئەوەندەی فسفۆڕی تێدایە کە دووسەد دار شقارتەی پێ دروست بکرێ!.

٨٩. کورە مۆجزەیەکی‌تر: مێشوولە تۆ چیت (٢٢) دانت هەبێ!. بەخوا سەیرە ئەسپ بۆیە بە پشووە لە هەڕاکردنا، چونکە سپڵی نییە. خوا هەقە حوشتریش زراوی نییە.

حەیوانی شاخدار سمی نییە. دیارە ئەو حەیوانەی سمی نەبێ شاخی هەیە. کوڕە بێجگە لە ئادەمیزاد. ئەویش حەیوانە، کەچی نە سمی هەیە و نە شاخ. ئەوە نازانم کە لە وەختی پەشیمانیدا شاخی لێ بڕوێ!.

٩٠. بورجەکەی شاری «بیزا» لە ئیتالیا گوایە بستێك بە لایەکدا خوار بۆتەوە و هەر ناکەوێ. ئەمە لە هەموو دونیادا ناوی دەرکردووە، کەچی منارەکەی مزگەوتی ئامێدی لە خوارەوە تا سەرەوە زیاتر لە بستێك خوار بۆتەوە هەر ناشرووخێ، کەچی کەس ناوی ناهێنێ!.

٩١. شای فەڕەنسە «شارلی» هەشتەم کە لە (١٤٧٨)دا مرد، ژنە بە مەینەتەکەی بۆی ڕەشپۆش بوو. ئەم ڕەشپۆشییەی ئەو ـ بەداخەوە ـ بوو بە باو لە وڵاتانی‌تردا. ئەرێ بابە ئێمە چیمان داوە بەسەر ڕەشپۆشییەوە؟ بۆچ واز ناهێنن؟!.

٩٢. هەر گیانلەبەرێك لەسەر زەویدا هەیە لە دەریاشا هەیە، بەڵکوو زۆری وا هەیە لە دەریادا هەیە و لەسەر زەویدا نییە. هەندێ لە گیانلەبەرەکانی دەریا مێژووی دروستبوونیان ئەگەڕێتەوە بۆ هەشتا ملیۆن ساڵ لەمەوپێشتر. بڕوا ئەکەی بیکە، بڕوا ناکەی بچۆ تاقی بکەرەوە.

◈◇◈

# تاڤگەی ئێلاخ

٩٣. دوو پیاوی لاڵ لەو سەرەوە لە ڕێیەکی چۆڵا بە یەك ئەگەن. یەکەمیان لەوی‌تر ئەپرسێ: «ئئئەرررێ بیرا گگگیان ببۆ کوێ ئئئوغر ئئئەکککەی؟»

کابرای دووهەم وا تێ ئەگا کە ئەم پیاوە گاڵتەی پێ ئەکا بەڵام گوێی ناداتێ. ئەمیش ئەپرسێ: «ئئئەی ببیرا گگگیان ئئئەتتتۆ ببۆ کککوێ ئئئەچی؟»

کابرای یەکەم وا تێ‌ئەگا کە پیاوەی دووهەم لاسایی ئەکاتەوە، تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «ححححیزی کککەران ببیاو! ببۆچی لاسسسایییم ئەکەیتەوە؟»

دووهەم ئیتر تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «هەهەی سسسەگگگباب ببۆچچچی ججججنێوم دددەدەیتێ؟»

- «ئئئەی تتتۆ ببۆچی لاسسسایییم ئئئەکککەیتەوە؟»

بەم جۆرە لەم وتەیەك و لەو دوان، لێیان ئەبێتە جەنگ. پاش ئەوە باش لەیەك هەڵئەدەن و هەریەك تەماشا ئەکا ئەوەی‌تر لاڵە، یەکەم ئەڵێ: «خخخۆ ئئئەوە خخخۆم وەهام».

ئەوی‌تریش ئەڵێ: «کککوره مممنیش وووەك تتتۆم».

ئەمجا دەست ئەکەنە ملی یەك و هەریەکە ڕێی خۆی ئەگرێ و ئەڕوا.

٩٤. کابرایەکی زەفتیە فێر بووبوو هەر جارە کە ئەچووە حەمام و ئەهاتە دەرەوە بە حەمامچییەکەی ئەوت ماڵتاوا بێ و لێی

ئەدا و ئەڕۆیشت، بەبێ ئەوە هیچ پارەی حەمام بدات. وەخت واش بوو مالاواییەکەشی نەئەکرد، ڕاست لێی ئەدا ئەڕۆیشت. بۆیەش وای ئەکرد چونکە زەفتیەیە و خەڵك ناوێرن قسەی لەگەڵ بکەن. ڕۆژێك لەسەر عادەتی جاران ئەچێ بۆ حەمام، خۆی ڕووت ئەکاتەوە ئەچێتە حەمامە گەرمەکە. وە کاتێ دێتە دەرەوە، سەیر ئەکا جلەکانی هیچی نەماوە، تەنها پۆستاڵە چەکەکە و قایشە دڕاوەکەی پشتی نەبێ. ئەویش بە حەمامچییەکە ئەڵێ: کوا جلەکانم؟ حەمامچیش ئەڵێ: نازانم جلت هەبووە یان نەتبووە! بڕوا ناکەم هەتبووبێ!. ئەکەونە کێشەوە؛ لە ئاخرا کابرای زەفتیە هەڵئەستێ پۆستاڵەکانی ئەکاتە پێ و قایشەشڕەکەی ئەبەستێتە پشتی و ئەچێ لە بەردەمی کابرای حەمامچیدا تەق سەلامێکی بۆ ئەگرێ و ڕوو ئەکاتە خەڵکەکە و ئەڵێ:

خەڵکینە بە ویژدانتان من بەم جۆرە هاتووم بۆ حەمام؟ حەمامچییەکەش ئەڵێ: «بەڵێ بەو جۆرە هاتووی. تۆ بۆ حەمام نەهاتووی بۆ سێبەری ئەشکەوتی جاسانە هاتووی. یەکێ بچێ بۆ سێبەری ئەشکەوت دیارە گەرمایەتی ئەچێ بۆ ئەوە فێنکی بێتەوە؛ کەواتە لەبەر گەرما خۆی ڕووت ئەکاتەوە».

(کابرای زەفتیە تێ ئەگا کە حەمامچی لە کوێوە قسە ئەکا)

**٩٥.** ساڵێك دەستەیە پۆلیس ئەچن بۆ ئەو شارەزوورە لە ئاوایی «قەدەفەر» ئەمێننەوە. لە پاش ماوەیەك ئەمریان بۆ دێ کە بگەڕێنەوە بۆ سولەیمانی. هەموو کۆ ئەبنەوە. تەماشا ئەکەن یەکێکیان کەمە. ئەو یەکەش «حەمە چاوشین» ئەبێ. مەکە ئەم حەمەچاوشینە حەزی لە ئافرەتێکی جوان کردووە. کە ئەزانێ ئافرەتەکە لەماڵەوە نان

ئەکا بە بیانووی برسیەتییەوە ئەچێتە ژوورەوە. ئەو کە جاران ئەیبینی ئافرەت خۆی داپۆشیبوو شێت بووبوو بۆی، ئێستا ئەم مەچەکە نەرموشلانەشی هەڵکردووە، هەر بە تەواوی هار ئەبێ.

ئەچێتە پێشەوە داوای نانی لێ ئەکا. ئافرەتەش نایەوێ دەری بکا، چونکە ڕەوشتی لادێ وا نییە یەکێ دەرکەن کە داوای نان ئەکا. پێی ئەڵێ: برام فەرموو نان ئەوەتە هەڵگرە. کابرا لە خۆشییا خەریکە بکەوێتە باڵ. هێز ئەداتە خۆی ئەچێتە پێشەوە نانێ هەڵئەگرێ. کە یەکەم پاروو ئەگرێ یەکێ لێ ئەدا. چی بکا، هەر ژنە ئەگرێتە خۆیا دەست ئەکاتە ماچ‌کردنی و خێراخێرا ئەڵێ: بەقوربانی چاوەکانتم لای کەس مەڵێ با ئابڕووم نەچێ. ژنەی بەسەزمانیش بە فێڵەکەی نازانێ، ئەڵێ: مەترسە برام مەترسە لای کەس دەنگ ناکەم.

نەخێر کابرا دەست ئەداتە نانی دووهەم، هەر بە چەشنی یەکەمجار ترێك‌تر بەر ئەداتەوە. ئەمجارەش پەلاماری ژنە ئەداتەوە و ئەڵێ: بیکە بە خاتری ئەولیایان لای کەس دەنگ مەکە با ئابڕووم نەچێ!.

ئەمجارە ژنە باش لە کابرا ئەگا. خۆی ڕائەپسکێنێ و گوڕ ئەداتە خۆی. تاو ئەداتە سەرە بزووتێکی قەوی و پەلاماری ئەدا. زۆر باش دوو سەری بزووت ئەماڵێ بە سەروگوێلاکیا و ئەڵێ: قەحبەباب !نیازت هەیە بە تڕ سواریشمان بی؟ یاڵڵا دەی. کابرا بە پەلە دەرئەپەڕێ، نانەکەشی بەدەستەوەیە. لەو وەختەدا دەرئەپەڕێ ماڵەکە سەگی دڕیان ئەبێ. سەگە پەلاماری کابرا ئەدا. کابرا لە پەلەپەلی و لەولاوە سەر بزووت و لەملاوە سەگ، پێ هەڵئەنگوێت ئەکەوێ. نانی لە دەست ئەکەوێتە خوارەوە. ئەمیش لە کەتنەکەیا سەروگوێی ئەکەوێتە لای نانەکە. سەگ کە چاوی بە نان ئەکەوێ پەلاماری نان ئەدا، کە نان هەڵئەگرێتەوە

کەڵبەی بەر گوێی کابرا ئەکەوێ. نیوەی گوێ و نانەکە پێکەوە ئەبا. کابرا خەڵاتی خوێن ئەبێ!.

پۆلیسەکانی‌تر و خەڵك کۆ ئەبنەوە و ئەڵێن: ئەمە چییە؟ ئافرەتیش لە ماڵ دێتە دەرەوە ئەڵێ: ئەم کابرایە هات برسی بوو، داوای نانی کرد. نانم دایە و گەڕایەوە دواوە؛ سەگێکی درمان هەیە سەگەکە پەلاماری دا کابرا ـ بلامانێ ـ دەستی کرد بە تڕ کەندن. سەگەکە لای وابوو ئەمە دەمانچەی پێوە ئەنێ. هیچ دەمانچەشی دیار نەبوو. لەو وەختەدا ئەمیش کەوت، سەگەکە نیشتە ملی و وای لێکرد. سەگەکەی ئێمە زۆر بەستەزمانە، بەڵام کابرا تڕەکەی خۆی وای لێکرد.

پۆلیسەکان کابرایان هەڵگرت بردیانەوە بۆ سولەیمانی. ئیتر لە دوای ئەوە مەنشوور بوو بە «حەمەتڕکەن».

**٩٦.** ڕەفیق ئەمین قادر، ناردی بۆ «ڕشتە» وتی: لەو وڵاتی ئاڵانە پیرێژنێك ئەبێ ئیشی هەر چیلکەکێشان ئەبێ و لەگەڵ کچانا ئەچوو. هەموو جار ڕووی ئەکردە کچەکان ئەیوت: هاوڕێکانم با بچین بۆ چیلکەکەمان. خۆی ئەبردە ڕیزی ئەوان. کابرایەکی پیر کە کۆنە هاوڕێی پیرێژنەکە ئەبێ و ئەم قسەیە گوێ لێ ئەبێ، ڕوو ئەکاتە پێرێژنە و ئەڵێ: «پرتی قوونت نەماوە و بە قوزی کچان دەمیزی».

**٩٧.** مەلا محەمەدی یاخیانی گێڕایەوە وتی: لە «دۆڵبێشك» پیاوێك هەبوو کوێخا ئەولایان پێ ئەوت. ئەم کوێخا ئەولایە پیاوێکی دەوڵەمەند و بەرچاوتێر و میوانپەروەر بوو، بەڵام لە لەشولارا زۆر بچووك و کەم نموود بوو.

جارێك ژنێك بارێ ترێ ئەبا بۆ ئەوێ بیگۆڕێتەوە بە ڕزقی‌تر، لەناو

دێدا ئەپرسێ: ماڵی کوێخا ئەوڵا کامەیە، پیشانی ئەدەن. ئەچێتە ئەوێ بار ئەخا و لە سەربان دەست ئەکا بە بانگەواز کردنی ترێ.

کوێخا ئەوڵا لە ماڵ ئەبێ، دێ بەلای ترێیەوە دەست ئەکا بە سەبەتەدا، هەر جارە بۆڵە ترێیەك دەردێنێ و ئەیخوا. ژنە نایناسێ، ئەڵێ: کوڕە ئەوە بۆ لووتت داژەندووە بەسەر ترێکەدا؟ نازانی ماڵی فرۆشتنە؟ بەخوا مەگەر کوێخا ئەوڵا نەیەتەوە ئەبێ پێی بڵێم هەر بە شەق بتکوژێ. کوێخا ئەوڵاش ئەڵێ: بڕۆ بڕۆ، لە ژنی کوێخا ئەوڵا بەم! ژنە ئەڵێ: گووت خوارد، تۆ چۆن قسەی وا ئەکەی بە کوێخا ئەوڵا؟

ژنە بانگەوازی ترێی لە بیر ئەچێتەوە و ئەکەوێتە کۆستی کوێخا ئەوڵادا، لە پاشا پێی ئەڵێن: کچێ ئەوە کوێخا ئەوڵا خۆیەتی. ئەڵێ: کوێخا ئەوڵا بەم خانەدانییە بەخوا حەیفە ئەمە ئەگەر ئەویش بێ ناماقووڵی وا بکا. شەڵڵا هەر وام بزانیایە کە لەماڵ نییە چاوم بەو قەد و باڵایە نەکەوتایە.

ئەنجا کوێخا ئەوڵا قاقا دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەڵێ: تۆ بانگەوازی خۆت کردووە، ئیتر مەیکە. ئەڵێ: بارەکەی بۆ بارکەن لە گەنم و سەرباریشی بۆ بخەنە سەر.

**٩٨.** هەر ڕەفیق گێڕایەوە وتی: جارێك مەلا حسێنی «دەشتێوی» وەعزی ئەدا لە سولەیمانی لە مزگەوتەکەی خۆیا. لە وەعزەکەدا وتی: لە حەدیسدا هەیە ئەڵێ: «ئەرز لەسەر پشتی گایە. گا لەسەر پشتی ماسییە. کاسە لەسەر ئاوە، ئاو لەسەر بایە». کابرایەکی «زەروون»ـی لەکۆڕی وەعزەکەدا بوو هەر کردی بە کەوشەکانیا و بۆی دەرچوو. وتیان: بۆ کوێ؟ وتی: وازم لێ بێنن با سەری خۆم دەرکەم وتی: «لەوە زۆر ئەترسم مناڵێکی لاسار پخێك لە گاکە بکا، کە ڕاچەنی ئەرزەکە ژێرەوژوور ئەبێ».

وتیان: مناڵ چۆن ئەگاتە لای گاکە؟ وتی: برا مناڵی سولەیمانی شەیتان ئەدۆزێتەوە، ئێستە ئەو گایە چۆن نادۆزێتەوە؛ کە دۆزییەوە پێش هەموو لایەك سولەیمانی ئەڕووخێ. نەوەڵڵا با تا زووە سەری خۆم دەرکەم.

٩٩. کابرایەکی دەوڵەمەند ژنێکی هێنا زەماوەند و ئاهەنگێکی زۆری گێڕا. لە پاش سێ مانگ ژنەکە خولامێکی تۆی بوو. لە باوکەکەیان پرسی: ناوی بنێین چی؟ وتی:

«ئەم مناڵە دیارە شاتری چاکە، نۆ مانگی بە سێ مانگ بڕیوە. کەواتە ناوی بنێین پۆستەچی!».

١٠٠. کابرایەکی «کرند»ـی بەیانی لە ماڵ دەرچوو، پاش نیوەڕۆ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. سەیری کرد وا کوڕە گەنجێکی جوان لە ماڵ دەرچوو و لەناو ڕاڕەوەکە تووشی یەك بوون. کابرا زانی چ باسە، ڕووی کردە کوڕەکە وتی: «خوا بیبڕێ ئەم ژیانەی تۆ هەتە، هەر ڕۆژێك سەر بە ماڵێکا ئەکەی. بچۆ بۆ خۆت ژنێك بێنە وەکوو ئێمە هێناومانە با چوار کەسیش لە تۆوە خێرێکیان دەستکەوێ!».

١٠١. کابرایەکی زۆردەیی حەڤدە ژنی هێنابوو. سەرە هاتە سەر ژنی هەژدەمین. لێرەدا تووشی بوو بە تووشی پیرێژنێکەوە. یەکەم شەو ئەچێتە پەردەوە ئەڵێ:

**سەلاموعەلێك ئەی بووکی پەردە   حەڤـدەم هێناوە بە تۆوە هەژدە**

ژنەکەش بە نازێکەوە لایەکی لێ ئەکاتەوە ،گۆشەیەکی چارشێوەکەی لا ئەدا و ئەڵێ:

**عەلەیکەسەلام ئەی زاوای زۆردە   هەژدەم کردووە بـە تۆوە نۆزدە**

لە پاشا دەست ئەکەن بە ئیشی خێر، لە کاتی ئیشا کابرا دەست ئەخاتە بیناقاقەی ژنە، ژنەش هەردوو گوێی کابرا ئەگرێ. کابرا ئەڵێ: ئەوە چی ئەکەی؟ ژنە ئەڵێ: ئەی تۆ چی ئەکەی؟ پیاوە ئەڵێ: نەوەك لە دەمتەوە بێتە دەرەوە. ژنەش ئەڵێ: منیش بۆیە گوێت ئەگرم ئەگەر کەوتیتە ناویەوە بنەوم لە گوێت ڕاتکێشم و دەرت بێنمەوە.

پیاوە ئەڵێ: کەواتە هیچمان لە هیچ. من ئەیکەم بە نۆزدە و تۆیش بیکە بە بیست. هەر لەوێدا لێك جیا ئەبنەوە.

١٠٢. لەو بەرکێوە پیاوێك هەبوو «سۆفی حەمەسەن»ـی ناو بوو. لەگەڵ ئەوەشا کە دەوڵەمەند بوو منالّی نەئەبوو. هەر ژنێکی ئەهێنا لە پاش ماوەیەك ژنە بۆ ئەوە منالێکی ببێ، دەستی ئەکرد بە چەتەیەتی. سۆفی حەمەسەن پێ ئەزانی و ناچار تەڵاقی ئەدا و ژنێکی‌تری ئەهێنا؛ ئەویش وەکوو پێشوو دەرئەچوو.

جارێك ژنێکی جوانکەلە و ڕێکوپێکی هێنا کە لە ئاوی شەو پارێزی ئەکرد. بەمە زۆر دڵی خۆش بوو. دەمێکیش بوو کە حەجی لەسەر واجب بووبوو، بەڵام لەبەر ئەوە کە کەسێ نەبوو لەلای ماڵەکەیەوە داینێ، پێی نەئەکرا بچێ بۆ حەجەکەی. ئەمجارە ئیتر دڵنیا بوو؛ هاتە سەر ئەوە کە یەکێك ڕاگرێ لای ماڵەکە داینێ با بە شەو ماڵ بێ پیاو نەمێنێتەوە. چوو گەڕا کەسی بەدڵ نەکەوت، ڕۆژێك کوڕێکی گێلۆکەی بەرچاو کەوت پێ وت: ڕۆڵە وەرە لای ماڵەکەم بە؛ من ئەچم بۆ حەج تا دێمەوە ئاگاداری ماڵ و کابانی ماڵ بکە. ئەمەی پێ وت. وتی: با تاقیشی بکەمەوە لە هیچ ئەزانێ؟ پێی وت:

ڕۆڵە ئەزانی کوز چییە؟ وتی: ئەی چۆن نازانم کوز ئەو کووزەڵەیە

کە شین ئەبێ و بە نانەوە ئەیخۆن؛ زۆر خۆشە. سۆفی حەمەحەسەن وتی: خوا داویە. کوڕەی بردەوە بۆ ماڵەوە، خۆی بارگەی پێچایەوە چوو بۆ حەج. کوڕە لە ماڵا بوو بە ڕەنجبەرێکی باش.

کوڕەی ڕەنجبەر بۆرە زەلامێکی چاك ئەبێ، سۆفی ژن خۆی لێ خۆش ئەکا. بەڵام کوڕە زۆر گێل ئەبێ. ئێوارەیەك ئاگر ئەکەنەوە لەگەڵ کوڕەدا دووبەدوو لەمبەر و لەوبەری ئاگرەکەوە دائەنیشن. حاجی ژن دەرپێی لە پێدا نابێ. بە جۆرێ دائەنیشێ کە دوابڕاوەکەی دەم بکاتەوە! کوڕە چاوی پێ ئەکەوێ. ئەڵێ: خانم ئەوە ئەو قەڵەشە چییە لەوێ؟ ئەویش ئەڵێ: ڕۆڵە ئەوە ڕۆژێك ئاغەت بە تەور داری ورد ئەکرد، منیش هەروا دانیشتبووم، تەورەکە دەرپەڕی دای لەوێ برینداری کرد، وا بەم جۆرە دەمی کراوەتەوە. کوڕە وتی: ئەی چاك نابێتەوە؟ وتی: بەرێوەڵڵا ئەگەر تیمار بکرێ چاك ئەبێتەوە، ئەبێ ڕۆنی تێکرێ.

کوڕ ئاگای لە هیچ نییە، زۆر بۆی ئەکەوێتە خەم و پەژارەوە. ژنە ئەزانێ کوڕە دۆش داماو ئاگاشی لە هیچ نییە، پێی ئەڵێ: ڕۆڵە! خەم مەخۆ تۆ ئەتوانی تیماری بکەی. کوڕە ئەڵێ: ئاخر نازانم. ئەڵێ: من خۆم فێرت ئەکەم چۆن دەرمانی کەی. هەڵئەستێ لنگەوقووچ بۆی ئەکەوێ و بە کوڕە ئەڵێ: وەرە ناو لنگمەوە. کە ئەچێ و حەیتە بۆنی دوابڕاوەکە ئەکا ڕاست ئەبێتەوە. ژنە ئەڵێ: بیخەرە سەر کونەکەوە پاڵی پێوە نێ. بەڵێ، ئەویش وا ئەکا. لەو وەختەدا کە ئەیەوێ ڕەحەت ببێ ژنە سەیر ئەکا کوڕە زۆر شرە. ئەڵێ: ئەوە چییە؟ ئەڵێ: خانم نازانم یا ئەمرم یا گوو ئەکەم بە خۆما. ئاغاژنیش ئەڵێ: قوونی خۆت توند بگرە نامریت.

ئیتر بەم جۆرە کوڕە فێر ئەبێت، هەر بەینێ نە بەینێ ئەڵێ: ئاغەژن هەستە با شوێن تەورەکەی ئاغام تیمار بکەین، بەڵکوو تا دێتەوە چاك بێتەوە.

حاجی لە حەج ئەگەڕێتەوە و کوڕە ئەچێ بە پیریەوە هەر لە دوورەوە بانگی ئەکا ئەڵێ: «ئاغا شوێن تەورەکەی تۆ کە دەمی کردبووەوە لەناو لنگی ئاغاژنما هەموو ڕۆژێ تیمارم ئەکرد، کەچی تا ئێستە هەر چاك نەبۆتەوە!».
حاجیاغای هەناسەسارد بە جارێ چووە تاسەوە و وتی: باشە باشە!.

**١٠٣.** ڕەفیق حەمەدەمین قادر مەلا، لە سولەیمانییەوە ناردی؛ وتی: ساڵێك فەقێیەك لە «چەقژ» هەبوو، هەندێ تەلەبە هاتنە ئەوێ. یەکێك لە تەلەبەکان ویستی گاڵتەیەك بە فەقێکە بکا. لێی پرسی: کاکە فەقێ ناوت چییە؟ وتی: ئەحمەد. وتی: کاکە فەقێ ئیعرابێکت لێ ئەپرسم بزانم ئەیزانی. وتی: فەرموو. وتی: «يا أحمقِ الحِمارَ»م بۆ ئیعراب کە. فەقێکە وتی:

**یا حەرفی «ندا» ئەحمەق تەرخیمە**
**میم مونادا موفرەد، مەعرفەی میمە**
**«فعــل» و «فاعل» بۆ وا مەجهوولن**
**تەلەبە و «حمار» هەردوو مەفعوولن**
**باشــە وا «حمار» هەر ســاڵە و ساڵە**
**بــەڵام تەلەبــە دایــم بــە فاڵــە**[1]

ئەڵێ: تەلەبەکە بەجارێ واقی وڕ ما. وتی: کاکە فەقێ ئێجگار واش نە. ئەویش وتی: کاکی خۆم جوابی سننان، قوزەڵقورتە.

---

[١. پێدەچێ ئەسڵی شیعرەکە ئاوابێ:
«یا» حەرفی «نِدا»، «احمَ» تەرخیمە — مونادای موفرەد، مەعریفەی میمــە
«قِ» فیعل، فاعیل لەوا مەجــهووڵە — تەلەبە و «حِمار» هەردوو مەفعووڵە
باشە وا «حمار» هەر ساڵە و ساڵە — بــەڵام تەلــەبە دایم بـــە فـــاڵە]

## چاو

١٠٤. هەر هی ئەوە: جارێکی واش لە «قایکەن» بە سواری ئەسپێك ئەدا بەلای دەستەیەکدا دانیشتبوون لە بن کەپرێکا. قالە ناوێکیان تیا بوو سەیری کابرای سواری کرد وتی: «سەیری ئەو ماینە کەن چۆن مل و کلکی کردووە بە یەك».

لەو وەختەدا کابرای سوار خەریکی ئەوە بوو سڵاو بکا. ماینەکەی سەرسمێکی دا، کەوت. کابرا بە هەرجۆر بوو، هەستایەوە، ماین خۆی بۆ نەگیرایەوە چاڵێك لە بەردەمیا بوو، گلێر بووەوە کەوتە چاڵەکە و تۆپی. کابرا چوو زینەکەی لێی کردەوە و دای بە کۆڵیا و چوو بەلای جەماعەتەکەوە وتی: توخوا جەماعەت ئەوە کێ بوو ئەو تیرەی تێگرتم؟ وتیان: ئەوە فلان‌کەس بوو. ئەویش وتی:

«پەککوو، بەخوا چاوێکی پیس و تیژی هەیە». هەرکە ئەو ئەوەی وت، کوتوپڕ قالە هەردوو چاوی کوێر بوو. ئەویش وتی: باوکم هەق بە هەق!.

١٠٥. وتی: ژنێك هەبوو لە «چەقڕ» پوورەخاتوونیان پێ ئەوت. مەشهوور بوو کە چاوی زۆر پیسە. ڕۆژێك دوو کوڕی خۆی لەگەڵا ئەبێ، ئەدەن بەلای خەرمانێکی زۆر گەورەدا. ڕوو ئەکاتە کوڕەکانی ئەڵێ: ڕۆڵە ئەم خەرمانە هی کێیە؟ بەخوا خەرمانێکی بێ ورەیە. یەکێ لە کوڕەکانی ئەڵێ: دایە ـ خوا بتگرێ ـ ئەوە خەرمانەکەی خۆمانە. پوورەخاتوون خێرا پەشیمان ئەبێتەوە ئەڵێ: «گووم خوارد، توخوا ئەوە چنگە کولۆشەکەی خۆمانە. ئەوە خۆ هەر تۆزێکە». (کولۆش: قرچە مەلۆی بچووکی گەنم و جۆیە).

١٠٦. ئەمە یەکێکە لە ئامۆژگارییەکانی ڕەحمەتی؛ ئەیفەرموو: بەزەییت بەمانەدا بێتەوە تا خواش بەزەیی بە تۆدا بێتەوە:

- ژنێکی جوان کە مێردەکەی چوو بێ بۆ سەفەر.

- دڵسووتاوێك کە یەکەمجار تووشی یارەکەی ئەبێ و حەیتەکەی هەڵناستێ.

- کابرایەك کە ئەچێتە ژوورەوە بۆ شایەتی و کابرای‌تر ئەو شایەتییەی بەدڵ نابێ؛ چونکە شایەتییەکەی ئەو لە قازانجی ئەو نابێ. کابرا لێی مۆڕ ئەبێتەوە ناوچاوی لێ کرژ ئەکا.

- ئەو دەستەیە کە لەسەر مێزی خواردنەوە دانیشتوون قومێکیان خواردووە و هێشتا سەرخۆش نەبوون، عەرەقەکەیان ڕژاوە.

- کوڕە گەنجێك کە بە دەست ژنێکی پیری قولتڕەوە گیری خواردووە.

- کچێك کە «بن»ـەکەی نەماوە و شەوی گواستنەوەشی نزیك بۆتەوە.

- ئەو ژنە کە جلێکی تەڕی لەسەر تەناف هەڵخستووە، کوتوپڕ تەنافەکە ئەپچڕێ، جلەکان ئەکەونە سەر خۆڵەکە. ئەویش ئەڵێ: ئەی.

١٠٧. عەلی باپیر هەبوو خۆی لە خۆیا دنیایەکی سەربەخۆ بوو. ئەو ژیانەی بەلاوە ژیان بوو کە لەگەڵ کوڕانی نەونەمامانا ڕایبوێرێ. تۆیش ئەیناسی.

جارێك شەو ئەبێ ئەو کوڕەی کە دڵی لەم سەندبوو، وە ئاوارەی دەشت و هەردی کردبوو، تووشی ئەبێ. دەست ئەکا بە گەمە و گاڵتە کردن لەگەڵیا. کوڕە بە مستەکۆڵە بەر ئەبێتە سەروگوێلاکی عەلی عاشق. لەم چنگەپرچێیەدا دەستی خوێناوی ئەبێ، یا خوێنی خۆی یا خوێنی سەر و پۆتەلاکی کاکە عەلی. ئەوەندەی‌تر تووڕە ئەبێت و دەست ئەداتە

خەنجەر لە کاکە عەلی. ئەویش ئەڵێ: بە خوێنی عاشقان ئەو دەستە جوانەت وا کە ڕەنگینە، بە خەنجەری دی نییە حاجەت. چییە ئەم جەور و ئەم کینە؟.

١٠٨. مەلا سمایلی کانیسکان جارێك لە سەربانی مزگەوتی گەورەدا بانگی ئەدا و بەدەم بانگەکەوە بەسەر بانەکەدا هەڕای ئەکرد. شێخ قادری حەفید چاوی لێ بوو پێ وت: مەلا سمایل ئەوە بۆچ بەدەم بانگەکەوە هەڕا ئەکەی؟ وتی: قوربان خەڵك پێم ئەڵێن: تۆ لە دوورەوە دەنگت خۆشە، بە دەم بانگەکەوە هەڕا ئەکەم با لە دوورەوە گوێم لە دەنگی خۆم بێ بزانم ڕاست ئەکەن کە من لە دوورەوە دەنگم خۆشە!. شێخ قادر دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: خوا بتگرێ مەلا سمایل بۆ خۆت و بۆ قسەت.

١٠٩. مەلا عەلی حاجی ڕەسووڵ هەبوو لە سولەیمانی جارێك ئەحمەدی کوڕی ئەکەوێتە ناو بیرێکەوە. مەلا عەلی سەر شۆڕ ئەکاتەوە بەسەر بیرەکەدا ئەیبینێ، پێی ئەڵێ: «کوڕم مەچوو بە هیچ لایەکدا تا ئەچم گوریسێك دێنم و ڕات‌ئەکێشمە دەرەوە!».

١١٠. حەکیم گێڕایەوە لە هەولێر وتی: لە گوندی «قوشتەپە» پیاوێك ئەچێتە لای مەلاکە ئەڵێ: مامۆستا پیاو کە ئەچێتە سەر پێشاو و ـ بلامانێ ـ تا چەند قنگی بشوا پاك ئەبێتەوە؟ ئەویش ئەڵێ: برام هێندە بشوا تا جیرەی لێوە دێت.

ئەمجا کابرا ئەچێتە سەر ئاودەست هەر ئاو ئەکا بە خۆیا ئەیشوا و دەستی پیا دێنێت. دێتە ئەوە جیرەی لێوە بێت، تڕێك ئەکەنێ. ئەڵێ: «ئەی بە کێری مەلاوە چاك جیرەی لێوە نەهات!».

١١١. هەر ئەو گێڕایەوە وتی: لە گوندی «عاڵلا» مام پیرداود ئەچوو بۆ شار، ژنان دەوریان لێ دا هەریەکە چەند دراوێکیان دایە بۆیان بدات بە شت. ژنێك لەناو ژنەکانا ئەویش چوو بەلای مام پیرداود وتی: مام پیرداوذ بە سەدەقەی سەرت بم! وی مەجیدیەم لۆم بەرە لۆم بدە بە دوو گەز جانگ لۆ ئاوەرکراس چم نینە.

مام پیرداود دوو گەز جانگی لۆ هێنا پلکەهامین ئاوەر کراسێکی زۆر تەسك و ترووسکی لێ کرد و هەندێکیشی مایەوە دای بەسەریا و چوو لەناو ژنەکانا دەستی کرد بە شایی و ئەیوت: هاوەر کراسم بە هاوەر کراستان، چەقەڵانەشم بە بەرتان. (چەقەڵانە: لەچکە).

١١٢. حەمەعەلی مەلا محەمەد گێڕایەوە وتی: جارێك لە «چناران» ڕۆژی جومعە ئەبێ و خەڵکەکە هەموو ئەچن بۆ نوێژی جومعە؛ لە نوێژی جومعەشا ئەبێ چل کەس بن، ئەوان سیونۆ ئەبن. چاو ئەگێڕن سەیر ئەکەن مامەحەمە نەهاتووە، ئەچن بە دوویا ئەڵێن: پیاوەتیت بێ وەرە با جومعەکەمان تەواو ببێ. ئەویش ئەڵێ:

«خۆ ماڵ و بیست نییە؛ من دوو کوڕم لە جمعەدایە. بە خودای بابم! پێ بێت و نایەمە بەر پێ؛ لە کوێوە هاتوون بچنەوە بۆ ئەو شوێنە».

١١٣. هەر ئەو گێڕایەوە وتی: مەلا محەمەد دەرگەڵەیی هەبوو، مەلا بوو لە «گەڵاڵە». ڕۆژی جمعان ـ کە سەلامی جومعەی ئەدایەوە ـ هەڵئەستا ڕووی ئەکردە خەڵکەکە ئەیوت:

«سەگبابینە! چاوان زەق مەکەن، کێر و ڕەق مەکەن و لە قوزی ژنی خەڵکی ڕۆ کەن!».

١١٤. پیاوێکی سمایل عوزەیری ئەبێ بە میوانی مەلایەك. مەلاکە دەورییەکی بچووك چێشتی برنج لەگەڵ دوو سێ نان ئەهێنێ و بە میوانەکە ئەڵێ: فەرموو. کابراش دەست درێژ ئەکا بۆ پاروو. مەلا دەستی ئەگرێ و ئەڵێ: «کتێب ئەفەرمووێ: بیسمیللا بکە؛ ئەگینە شەیاتین و جنۆکە لەگەڵمان ئەخۆن». کە لە نان خواردن ئەبنەوە مەلا ئەڵێ: چاوت لێ بوو بیسمیللا چەند بە بەرەکەت بوو؟ کابرا هەرچەندە تێریشی نەخواردبوو بە ناچاری وتی: بەڵێ قوربان واسە.

چەند ڕۆژێکی پێ چوو بە ڕێکەوت مەلا ئەبێ بە میوانی سمایل عوزەیری. کابرا لەنگەرییەکی زل نان و ڕۆن و شلکێنە ئەهێنێ و دائەنێ ئەڵێ: فەرموو: مەلا قۆڵی لێ هەڵئەکا ئەیەوێ بڵێ: بسمیللا، کابرا توند دەست ئەگرێ بەسەر دەمیا و ئەڵێ: وەکەلام بێژی بیسمیللا دەم و دگانت ئەشکێنم. تۆ ئەگەر ئازای هەی جن بکە. خۆی هەردوو قۆڵی ڕائەوەشێنێ و دەست ئەکا بە های جن های جن بێنو بێنو!.

١١٥. کابرایەکی کورد ڕۆژێك ئەبێ بە میوانی پیاوێك؛ نان دائەنێن. میوانەکە یەکەم پاروو هەڵئەگرێ بیبا بۆ دەمی، خانەخوێکە ئەڵێ: «برا ڕاوەستە پاروەکەت موویێکی پێوەیە». کابرا ئیتر پاروەکە دائەنێ و ئەکێشێتە دواوە.

خانەخوێکە ئەڵێ: ئەوە بۆچی چوویتە دواوە؟ ئەویش ئەڵێ: «بەخوا برا تۆ ئەوەندە بەرچاو تەنگ بی، وەها سەیری پارووی هەوەڵم بکەی من ئەم نانەم پێ ناخورێ!».

١١٦. کەلای ئەڵێ: لە شێخ مراد ئەپرسێ ئەڵێ «سەید قلیە وە قاف کەنەی یا وە غەین؟» ئەویش ئەڵێ: سەید کەلای: نە وە قاف کەنەی نە وە غەین؛ وە گوشت کەنەی، بچوو قەرێ بارە تا بخوەنەی.

.١١٧ ساڵێك لە زەمانی تورکەکانا «داسنی» کوشتن باوی پەیدا کردبوو؛ خەڵك زۆر ئەچوون. هەرکەس کە ئەهاتەوە سەری داسنێکی ئەکرد بەسەر شیر وەیا تفەنگ حسکەکەیەوە بۆ ئەوە بە خەڵکی پیشان بدا کە داسنێکی کوشتووە.

باوکی عەزەکونەماسی هەبوو ئەویش لەگەڵ ئەو عێلجارەدا ڕۆیشتبوو. لەولاوە کە هاتبوونەوە ئەویش «پێ»یکی کردبوو بەسەر لوولەی تفەنگەکەیا. لێیان پرسی: ئەمە کێ کوشتوویەتی؟ وتی: من. وتیان: ئەی سەرەکەیت بۆ نەهێنا؟ وتی: «تا من فریا کەوتم چوومە سەری، سەری پێوە نەبوو؛ بردبوویان!».

.١١٨ کابرایەکی قەڵخانی بێ توتنی هێنابووی بەسەریا، لەو وڵاتی کرماشانە ڕۆژێك سواری خانمێك ئەبێت. لە وەختی ئیشا خانم ـ بلامانێ ـ تڕێك ئەکەنێ. کابرا ئەڵێ: خانم دوای خۆت بگرە. خانمیش ئەڵێ: «ئاغا لە ئشق ئەو سەر سوورەی تۆ توانای دواگرتنم چووە!».

.١١٩ کابرایەك لەو گەرمیانە مریشکێك ئەکڕێ و ئەیباتەوە بۆماڵەوە. وەخت نزیکە و ڕەمەزان ئەبێ. مریشکەکە ئەدا بە ژنەکەی و پێی ئەڵێ: ئەمە هەڵگرە بۆ ڕەمەزان.

کابرایەکی قوماربازی «ڕەمەزان» ناو، گوێی لێ ئەبێ، دەنگ ناکا تا دەرفەتی بۆ هەڵئەکەوێ. ڕۆژێك مێردی ژنە لە ماڵ نابێ، کابرا خۆی ئەکا بە ژوورەوە ئەڵێ: لالەم ناردمی بۆ مریشکەکە. ژنەش ئەڵێ: بۆچی تۆ ڕەمەزانیت؟ ئەڵێ: بەڵێ. ژنە ئەچێ لە کولێن مریشکەکە دەرکا، دەرپێی لە پێدا نابێ، ماڵی حەڵاڵ دەرئەکەوێ. کابرا لە دواوەخۆی پێدا ئەدا و ئەبێ بە زاوا. ژنە مریشکی بۆ دەرئەکا و ئەیداتێ. کابرا بە نان و گانەوە

لێ ئەدا ئەڕوا.

ئێوارێ ژنە مێردەکەی دێتەوە پێی ئەڵێ: ڕەمەزانی باوەحیز هات مریشکەکەم دایێ ڕزگارم بوو لە دەستی. کابرا ئەڵێ: ڕەمەزانی چی؟ ئەڵێ: ئەی تۆ نەتوت مریشکەکە بۆ ڕەمەزانە؟ منیش لێم پرسی: تۆ ڕەمەزانیت؟ وتی: ئا؛ ئیتر دامێ. کابرا وتی: بەخوا چاکی گاویت. ئەویش وتی: تڕحێو با من سەرم لە کولانەکەدا نەبوایە بێتوانیایە بیگامایە!.

١٢٠. ژن و مێردێك لێك زیز بووبوون. وا دیار بوو ژنەکە لە مێردەکە زیز بووبوو؛ ئیتر لە بەرچی بوو ئەوە من نایزانم؛ ڕەنگبێ تۆ بیزانی. ئەمانە منالْیان هەبوو. ڕۆژێك پیاوەکە دانوولەی بۆ منالْەکان کردبوو، بۆی دانابوون. پێی وتن: بخۆن دەی با کێرتان ئەستوور بێ. ژنەکەی لە قوشبنێکەوە گوێی لێ بوو وتی: «ئەی دوژمنی لەشی خۆت! خۆت بۆ دوو دەنك ناخۆی؟ هەر ئەیکەی بە قوڕگی ئەوانا!».

١٢١. پیرێژنێکی زۆر پەڕپووتی پیر هەبوو. لەوانە بوو لەبەر پیری تۆزێ ئەقڵەکەشی کەم بووبوو. کوڕوکاڵ ئەکەوتنە شوێنی ئەیانوت: نەنە دەنگی ئەوەی خوارەوەت چۆنە؟ ئەویش دەستێکی ئەخستە سەر دەمی و ئەوی‌تری ئەخستە سەر دوابڕاوەکەی و ئەیوت: «تا ئەو بیەوێ ئەوەش ئەیەوێ!».

١٢٢. عوسمان محەمەد ساڵح گێڕایەوە وتی: تازە ئەم قسەیە داهاتبوو کە هەر شتێکی ناخۆش ڕووی بکردایەتە یەکێ پێیان ئەوت: «گوێ مەدەرێ پێچی مێزەرێکە»؛ واتە: زوو بەسەر ئەچێ. پیاوێکی کوێری قسەقوت هەبوو لە سولەیمانی برایەکی لەسەر هەر شتێك بوو، پانزەساڵ ئەبوا لە بەندیخانە بوایە. خەڵکوخوا ئەچوونە لای براکەی دڵیان

ئەدایەوە ئەیانوت: «هیچ نییە، پێچی مێزەرێکە. ئیشەڵڵا زوو ڕزگارت ئەبێ». ئەوەنەیان ئەم قسە پێ وتبوو ئیتر جیقڵدانەی هەڵی نەگرت وتی: «کوڕە لە قەبری دایکی ئەو مەلایە ئەبەم کە بە پانزە ساڵ مێزەری ئەبەستێتەوە!».

١٢٣. کابرایەك لە «تەوێڵە» هەبوو «زۆراب»ـی ناو بوو؛ نوێژی نەئەکرد. کابرایەکی دراوسێیان هەبوو پێی وت: «ئەگەر نما نەکەری سان مەکشۆت». ئەویش لە نوێژی ئێوارەدا سەرەتا چووە مزگەوت و دەستی پێ‌کرد. نیەتی هێنا وتی:

«نیەتم هەنە یەرێ ڕکاتێ نما کەروو پەرێ سانی. ئانەی نیەت مارۆ زۆرابەن. "اللّٰهاکبر"».

١٢٤. جارێك فەقێیەك ئەچێتە خزمەتی شێخ بابەعەلی تەکیەیی ئەڵێ: قوربان «کافیە»م کردووە بە شیعر. ئێستە نیوە شیعرێکم داناوە، نیوەکەی تریم بۆ نایەت. ئەڵێ: ئەو نیوەیە چییە؟ تا من نیوەکەی ترت بۆ دانێم.

ئەڵێ: قوربان! «الکلمة لفظ وضع». شێخ بابەعەلیش ئەڵێ: «کێری کەرم بە قنگت وع!».

١٢٥. کوێخا حەوێزی «شاخەپیسکە» دایکی ئەمرێ، پوورە مەیرەم هەبو ئەچێ ئەیشوا، هەموو جار بە کوێخا حەوێزی ئەوت: کوێخا دایکی ڕەحمەتیت ژنێکی بەهەشتی بوو، لەو وەختەدا ئەمشۆرد هەر پێ ئەکەنی! چەند جارێك ئەمەی وت: هەر جارەش کوێخا حەوێزی لەبەر خاتری قەبرەکەی دایکی شتێکی ئەدایە. لە ئاخرا پوورە مەیرەم لە تامی دەرکرد! ئاخر جار وتی: پوورە مەیرەم وازبێنە ئەوە بە قوزی تۆ و

ئەقڵی من پێ ئەکەنێ، ئەگینا کەی ئەم شوێنە شوێنی پێکەنینە!؟

١٢٦. کابرایەکی کۆیەیی عەزیزی ناو بوو، جارێك ئەچێتە شاخەپیسکە لە ماڵی ناسراوەکەیا نان و ماست ئەخوا. دەم و لێوی پاك ناکاتەوە، ماستەکە هەروا بە لێویەوە ئەبێ. بەو جۆرە ئەچێتە لای کوێخا حەوێز. کوێخا حەوێز لێی ئەپرسێ: عەزە ئەوە چیت خواردووە؟ ئەڵێ: کوێخا وەڵڵا ئێستە کە گەیشتمە جێ، لە ماڵی خانەخوێکەما مریشکێکیان بۆ کوشتبوومەوە، بەبێ تۆ ناخۆش، مریشکم خوارد. کوێخا حەوێزیش ئەڵێ: وەڵڵا عەزە ڕاست ئەکەی؛ ئەوەتە ڕیقنەکەی بە بەر کولانەکەوەیە!.

١٢٧. مەلا محەمەدی دەرگەڵەیی لە گەڵاڵە ڕۆژی جمعان خوتبەی ئەخوێند. کە ئەچووە سەر مەنبەرەکە دارێکی ئەگرت بە دەستەوە لە کاتی خوتبە خوێندنەوەکەدا ڕایئەوەشاند. پێیان وت: مامۆستا خەتیب کە ئەچێتە سەر مەنبەر شیر ئەگرێ بە دەستەوە، تۆ لەباتی شیرەکە دارێك ئەگری بە دەستەوە؛ ئەوە بۆچی؟ ئەویش ئەیوت: ئەم تولەبابانە پیویست ناکا من شیریان بۆ بگرم بە دەستەوە، ئەگەر بە گوێیان نەکردم بەم دارە سەروبەچکیان ئەنێمە یەك و ئەیانترێنم بە گۆڕی بابیانا.

١٢٨. کابرایەك هەبوو لەو خوارە کوڕێکی هەبوو یەکێك لێی پرسی: بڕوا ئەکەی ئەم کوڕەت هیچی لە تۆ ناکا. ئەویش وتی: «برا بۆچی درواسێ دێڵێ مناڵەکانمان لە خۆمان بکەن!».

١٢٩. کوڕێکی باقلانی چووبووە فەقێیەتی، گەیشتبووە کتێبی «أنموذَج». هەر کە کتێبەکەی ئەگرت بە دەستەوە خەوی لێ ئەکەوت. وەختی سەردانی ماڵی خۆیان هاتبوو، چووەوە بۆ سەردان.

مانگایەکیان هەبوو زۆر لاسار بوو، نەیئەهێشت بیدۆشن. دایکی کوڕە بە تەواوی بە دەستیەوە کەوتبووە عەزیەتەوە. ئەوا دایکی کوڕە مانگای هێناوە گوێرەکەکەی خستۆتە بەردەمی، خۆیشی گۆرانی بۆ ئەڵێ؛ کەچی مانگا هەر لەقە ئەهاوێژێ و نایەڵێ بیدۆشن. کوڕەی فەقێ هەر کە چاوی بەمە کەوت، خێرا چوو «أُنموذَج»ـەکەی هێنا لە بەردەمی مانگادا پانی کردەوە. دایکی وتی: ئەوە چی ئەکەی ڕۆڵە؟. فەقێ وتی:

دایە، دەنگ مەکە با خەوەکەی لێ نەزڕێ! هەر ئێستە خەوی لێ ئەکەوێ، بە ئارەزووی خۆت و بە شێنەیی بیدۆشە. من هەموو جار کە کتێبەکە ئەگرم بە دەستمەوە خەوم لێ ئەکەوێ. لێگەڕێ ئێستە ئەمیش خەوی لێ ئەکەوێ. هەر تۆ دەنگ مەکە با خەوەکەی نەزڕێ!.

۱۳۰. مەلا فەتتاح هەبوو لەو موکریانە، هەتا بڵێیت ناشیرین و ناهەموار بوو، بەڵام لە قسەدا گرەوی بردبۆوە، زۆر قسە خۆش بوو. کوڕێکیشی هەبوو مەلا عەلی ناو بوو، مەلا عەلی لە فەقێیەتی بوو هەموو جار هاتوچۆی ماڵی خۆیانی ئەکردەوە بۆ سەردان، بە پێچەوانەی باوکی، ئەم ئینسانێکی ڕێکوپێک و جوانچاك بوو. مەلا فەتتاح وەکوو عادەتی هەموو پیاوێکی بە وەرع و بەدین دائیما ئاوێنە و کاوکلتوور و مەقەستی پێبوو بۆ ڕێکخستنی سەر و ڕیشەکەی و چاوڕشتنەکەی، مەلا عەلی کوڕی هەر جار کە ئەچووە ماڵەوە سەیری ئەکرد ئەوا باوکی چاوی ڕشتووە و ئاوێنەکەی بە دەستەوەیە شوکری خوا ئەکا، ئەڵێ: حەمد و سەنا بۆ ئەو خوایە کە ئێمەی بە چاکترین سوورەت دروست کردووە. مەلا عەلی کوڕیشی هیچ دەنگی نەئەکرد.

ڕۆژێك مەلا عەلی چووە دەرەوە یەکێك لێی پرسی: باوکت لە ماڵە؟ وتی: بەڵێ. وتی: چی ئەکا؟ وتی: چی ئەکا؟ خوا ئەخا بە درۆوە!

١٣١. عوسمان شارباژێڕی گێڕایەوە وتی: لەو بەر کێوە کابرایەکی ڕەزاقورس ئەبێت بە میوانی ماڵێك. تۆزێ ناسراوی پێشوویان هەبوو لەگەڵ ماڵەکەدا. کابرا بۆی دائەکوتێ و هەر ناڕوا. ماڵەکەش هەرچەندە پلاری تێئەگرن کاری تێ ناکا.

ڕۆژێك ژنی خانەخوێکە پێی ئەڵێ: ئێستە مناڵەکانت بەستەزمانانە، لەوانەیە لەبەر ئەوە کە دەمێکە نەیاندیوە، ئەبێ دڵیان زۆر نارەحەت بێ! ئەوە هیچ بیریان ناکەیت؟ لەوانەیە ئێمە بیریان ئەکەین، تۆ چۆن ئەبێ بیریان نەکەی؟ توخوا کە چوویتەوە لەباتی ئێمەش چاوت پێیان بکەوێ. کابرای میوان وتی:

وەڵڵا ڕاست ئەکەی، وەختە سوێم ببێتەوە بۆیان. هەر ئێستە ئەچم ڕائەسپێرم هەموو بێن بۆ ئێرە، با ئێوەش چاوتان پێیان بکەوێ. ئەوە باشترە بۆ سوکنایی ئێوە تا من خۆم بە تەنیا بچم و بیانبینم!.

١٣٢. زەمانی زوو ئەوەی کە ئێستە پێی ئەڵێن «مەحامی» وەیا «پارێزەر» دانەهاتبوو. لەباتی ئەم ناوە «ئەوقات»، وەیا «وکیل مرافعە» هەبوو. هەر کارەساتێك ڕووی ئەدا سەرچاوەی هەموو «مەلا» بوو، کە ئەو کارەساتانەی ئەبڕیەوە. بەمانە ئەوترا «شەرع». جا ئەگەر کارەساتێك ڕووی بدایە، داواکەر وەیا داوا لێکراو ئەوقات وەیا «وکیل مرافعە»ی ڕائەگرت. ئەم ئەوقات و وەکیل مرافعانەش هەر مەلا وەیا میرزا بوون.

جارێك کابرایەك جنێو ئەدا بە کابرایەکیتر، ئەڵێ: کێری ڕووت بە قوزی دایکت. کابرا چووە لای مەلا شکاتی کرد کە جنێوی وای داوەتێ. مەلا ناردی بەشوێن ئەویترا. ئەویش لەبەر ئەوە کە ئیشەکە زل بوو، «وکیل مرافعە»یەکی ڕاگرت. هەموویان چوونە لای مەلا. مەلا ڕووی کردە

کابرای جنێودەر: کە تۆ جنێوێکی وات داوە بەم پیاوە و ئەمە «قەزف»ـە.

«وکیل مرافعە» هەڵیدایە وتی: ئەمە جنێو نییە، با ئەگەر کێرەکەش کێری باوکی بێ. مەلا ڕووی کردە جنێوپێدراو وتی: هیچ هەقێکت نەما بەسەر ئەو پیاوەوە. ئەمە «قەزف» نییە. بڕۆ با کێری بە قوزی دایکی «وکیل مرافعە» بێت. «وکیل مرافعە»ش دەمی ئەبێ بە تەڵەی تەقیوە و ڕازی ئەبێ بە قەزا و قەدەر.

١٣٣. کابرایەکی «کەڵەکن»ـی ئەچێتە لای مەلا تۆفیقی عەتار ئەڵێ: ئەو ڕۆژە چوومە «پیرەمەگروون». لەوەتی هاتوومەتەوە مووی ڕیشم هەمووی ژان ئەکا. ئابزانە بە خێری خۆت دەرمانێکم نادەیتێ تۆزێ چاك ببێ. ئەویش ئەڵێ: چیت خواردووە؟ ئەڵێ: وەڵڵا لەوێ پارچەیێ نانم بە سەهۆڵەوە خوارد. ئەڵێ: بڕۆ مردووت مرێ! بمرە بۆ خۆت. نە خواردنت لە خواردنی موسڵمانان ئەکا نە دەردت لەدەردی گاوران ئەکا!.

١٣٤. ئەڵێن: پادشایەك سێ ژنی هەبوو، یەکێ ئاری، یەکێ سامی، یەکێ چەرکەسی، شەوێك لەگەڵ ژنە ئارییەکەی نوستبوو لێی پرسی: دنیا چ وەختە؟ وتی: دەمەوبەیانە، وتی: بە چیدا ئەزانی؟ وتی: بۆنی گوڵان لەگەڵ دەنگی بولبولان و نەوای قومرییان ئاهەنگی عەترەفشانی و نەواخوانی ئەگێڕن، دڵی دڵدار مەست ئەکەن، باوەشێنی خاڵی سەرگۆنای نازداران ئەکەن. شەوی دووەم لەگەڵ ژنی سامیدا نوست، لێی پرسی: دنیا چ وختە؟ وتی: بەری بەیانە. وتی: بە چیدا ئەزانی؟ وتی: ملیوانکەی مواریم کە ئەکەوێتە سەر سینەی قاقمم، فێنکی و ساردییەکی بە ئاستەمی وا هەست ئەکەم وەکوو ئەو ساردییە کە لە شاباڵی بە لەنگەری پەرییەوە بێت و بدا لە ئەگریجەی نازدارێك بیشەکێنێتەوە و ئەو نەرمە

بدا لە گۆنای ئاڵی ئەو نازادارە، ئەو چ هەستێك ئەكا بەو فێنكە سینەی منیش ئەو هەستە ئەكا.

شەوی سێیەم لەگەڵ ژنی چەركەسیدا نوست، لێی پرسی: دنیا چ وەختە؟ وتی: دەمەورۆژە. وتی: بە چیدا ئەزانی؟ وتی: شەروەت وێ لە ڕووتا گوو تاوی داوم!.

.١٣٥ دڵ سووتاوێك دەمێ ساڵ بوو دڵی چووبوو لە یارەكەی، هەر بەشوێن هەلێكا ئەگەڕا لە جێگایەك دەستی كەوێ. ئاخری لە پاش چاوەڕوانییەكی چەند ساڵە، جارێك لە شوێنێكی بێدەنگدا دەستی كەوت و خۆی تێ‌هەڵسوو؛ بەڵام حەیتە لە خەودا بوو، هەر بۆی هەڵنەستا. ئەمجا بە ناچاری ڕووی كردە یار و وتی:

لە پاش چەند ساڵ كە ڕێمان كەوتە ناو دەوڵەتسەرای ڕانت، وتت: لاچۆ لە خەودایە بلوورینم چییە كارت. یاریش ئیتر پێی هەڵنەگیرا وتی: دەمێ بوو لافی مەردیت لێ ئەدا نەشتەر لە كارایە، كەچی وەك پەتكی بارە بەڵام سەری شۆڕی لە ئەرزایە.

.١٣٦ ئەحەی ناسر وەكوو گۆینـدە بوو، ڕەندیش بوو. هەر شتێكی بەسەر بهاتایە خۆی ئەیگێڕایەوە؛ دەنگی ئەوەشی هەبوو كە سەروسەودای لەگەڵ مناڵاندا هەیە. ئەحمەد عەزیزئاغا بۆی گێڕامەوە وتی: ئەحەی ناسر خۆی بۆی گێڕامەوە وتی:

ئەوا جارێك لە كەركووك مناڵێكم تاو دا بردمە شوێنێك. كە هاتینە دەرەوە گوێم لێ بوو مناڵێكی‌تر بەو مناڵەی وت: ئەوە چیت ئەكرد لەگەڵ ئەو پیاوەدا؟ وتی: وەڵڵا بردمی كێشامی بەسەر خۆیا. منیش وتم: سوبحانەڵڵا هەتیوبازیش حەرام بوو، مەگەر بە وەلی و دوو شاهید نەبێ!.

١٣٧. دیسان هەر ئەو گێڕایەوە وتی: ئەحەی ناسر وتی: جارێك هەتیوێکم تاو دا بە دوو تارانی. هەتیوەکە وتی: هەر بیخەرە ناو ڕانم واز بێنە. وتی: منیش وتم: ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ من ئەوە چل‌وپێنج ساڵە لەناو ڕانی خۆمایە. جا ئەگەر وابێ ئیتر ئەم دوو تارانییە بۆ بدەم!.

١٣٨. سەی کەریم لای شێخ «حسام‌الدین» گێڕایەوە وتی: ئەوا لە باخەکۆن مەجلسی شێخ پڕە. مورید و سۆفییەکی زۆر دانیشتوون. لەو وەختەدا سۆفی ڕەشید کردی بە ژوورا و هات. شێخ فەرمووی: سۆفی ڕەشید! شێخ حەبیبەڵڵای خواشت چۆنە؟ ئەویش سێ و دووی لێ نەکرد وتی: عەمری نەمێنێ وەویەکەی خۆی گا!.

(ئەمەش ئەوە بوو کە چووە خوازبێنی ژنێك بۆ کوڕەکەی. ئەوانیش وتوویانە کوڕەکەت پیاو نییە؛ وتویە: کەواتە بیدەن بە خۆم. ئەوانیش داویانێ).

١٣٩. مەلا سمایلی کانیسکانی جارێك تووشی کوڕێك ئەبێ، سا لەبەر هەر شتێك ئەبێ سەر ئەخاتە سەر کوڕەکە. کوڕە تۆزێ خۆی هەڵئەگوشێ و ناوچاوی دێنێتەوە یەك، وەکوو یەکێ ژانێکی پێوە بێ. لێی ئەپرسێ: ئەوە چیتە؟ کوڕە ئەڵێ: وەڵڵا دومەڵم دەرکردووە. ئەڵێ: لەکوێ؟ ئەڵێ: بلامانێ لە کونی قنگمەوە. ئەڵێ: هەتیو تۆ قسەیەك بکە بچێتە ئەقڵەوە. ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: دمەڵ عادەتی وایە لە شوێنی تەنگ دەر ئەچێ، چۆن لە شوێنیکی فراوانی ئەوەی تۆوە دەرچووە؟!

١٤٠. دەروێش حەمەعەلی باخانی گێڕایەوە وتی: جارێك ڕێم کەوتە زێوەیەی پیرەمەگروون. ڕۆژی جومعە بوو چووم بۆ مزگەوت بۆ نوێژ. مەلاکە دەستی دا بە خوتبەوە (ناوی مەلاکەشی وت، بەڵام

ڕاستی من لەبیرم نەماوە کێی وت). کوڕێکی هەبوو لەو کاتەدا هات دەستێکی خستە ئەملای دەرگاکەوە دەستەکەی تری خستە ئەولایەوە. ئەوا مزگەوتەکەش پڕە لە خەڵك. بانگی کرد: بابە! کەرەکە ئەگێیت! یا بیبەم بۆ لەوەڕ؟ بابیشی هیچ خۆی تێك نەدا وتی: ڕۆڵە بیبە.

١٤١. کابرایەکی سمایل عوزەیری هەبوو لەو وڵاتی چەقۆ و قایکەندە «دەروێش ڕەحیم»ـی ناو بوو. ئیش و کاری هەر دزی بوو. شەوێك ئەچێ بۆ دزی و هیچی دەست ناکەوێ. کەرەکێکی پێ ئەبێ دایئەکەنێ ئەیداتە بن دەستی و دێتەوە. ژنەکەی ئەچێ بە پیریەوە. کەرەکەی بە گرتمۆڵەکی لێ وەرئەگرێ. لای وائەبێ بوخچە جلی دزیەتییە هێناویەتەوە. کە سەیر ئەکا ئەما کەرەکەلۆتی ڕەحیمە. ئەڵێ: ڕەحیم ئەوە چیت هێناوە؟ ئەڵێ: ئەوە کەرەکە. ئەڵێ: ماڵ وێران ئەوە کەرەکەکەی خۆتە. ئەڵێ: ئافرەت دەنگ مەکە ئەگەر بە دەستی خاڵی بهاتمایەوە کسمەکەم لێ تێك ئەچوو، ئەوەم لە خۆمان دزیوە تا بە دەستی خاڵی نەگەڕێمەوە!.

١٤٢. مەحمووآغا هەبوو لەو وڵاتی دێبوکریە. لە کاتی خۆیا دڵی چووبوو لە ژنێکی پشتماڵە، هێنابووی. کوڕێکی لێ بووبوو، کوڕ گەورە بوو و بوو بە کوڕێکی قۆز و جەحێل و لە ڕاستیدا پیاوێکی پیاوانەی لێ دەرچووبوو، بەڵام باوکی هەر لێی ڕازی نەبوو، وە بەڵکوو هەموو جار هەر قسەی پێ ئەوت و لەوانەبوو لەگەڵ کوڕەکانی تریا ـ کە لە ژنێکی تر بوون ـ جیای ئەکردنەوە. کوڕە لە باریا نەما، ئیتر ڕۆژێك وتی: تۆ ئەم هەموو قسەیە بە من ئەڵێی لەبەر ئەوەیە کە دایکم پشتماڵەیە. ئەمە سووچی خۆت بوو با تۆزێ خۆتت بگرتایە بچوویتایە ژنێکی خانەدانت بهێنایە با

کوڕێکی ببوایە وەکوو خۆت و براکانم پیاو بوایە. مەحمووئاغا سەری داخست و وتی: ڕۆڵە! تۆ کوڕمیت من بە هەڵەدا چووم.

١٤٣. ساڵێك دەستەیەکی کوڕوکاڵی سولەیمانی بۆ سەیران ئەچن بۆ سەراوی سوبحاناغا. لەسەر کانییەکە ڕایەخی لێ ڕائەخەن و بەزمی خواردنەوە ئامادە ئەکەن. پیرێژنێکی جافی ئەو ناوە وا دیار بوو ئەو ساڵە لە عێل بەجێ مابوو. بەلایانا تێئەپەڕێ، سەیر ئەکا ئەوانە شووشە و قاپیان داناوە و شتێك ئەخۆنەوە. بەلایانەوە ڕائەوەستێ و سەیریان ئەکا. لە پاشا ئەڵێ: ئەرێ برا، ئەوە شەروەتی شارییە ئەیخۆنەوە؟ ئەوانیش ئەڵێن: بەڵێ. ئەڵێ: ئا قۆمێکیش بدەن وە من. ئەوانیش لەناو پەرداخێکا لەو شتە خۆشەکە بۆی تێ ئەکەن و ئەیدەنێ. ئەویش ئەینێ بە سەرەوە. کە ئەیخواتەوە تۆزێ کەیف ئەیگرێ و بزەیەکی بۆ ئەکا. ئەڵێ: برا وە کەلام چکێ تفتوو، وەلێ فرە خۆش وو؛ ئا قومێکیتریشم پێ نادەن؟ ئەوانیش قومێکیتری ئەدەنێ. پیرێژن بە تەواوی سەرخۆش ئەبێ و نەشئە ئەیگرێ. ئەڵێ: ئا تۆ دەنگ! ئەرێ کوڕە شاری ئا لەم شەروەتی ئێوە ژنەکانیشتان ئەیخۆنەوە؟ ئەڵێن: بەڵێ. ئەڵێ: دەسا وەو سەیساقە هەرچێ ژنەکانتانە وە شەو و وە ڕۆژ هەر خەریکی مێخوەنی کوزیانن. ئێوە کەستان باوکی خۆتان ناناسنەوە.

١٤٤. کابرایەك کوڕێکی هەبوو هەر جارە ئامۆژگاری ئەکرد و ئەیوت: ڕۆڵە هەموو جار پێت ئەڵێم: تۆ ئەبێ بۆ ژیانی پاشەڕۆژت شتێکت بە دەستەوە بێ بۆ ئەوە پێوە بژیت.

پێت ئەڵێم تەنافبازی فێر بە. هونەری سەرمەقولات، جوێ سەگەوانی فێر بە، قومەشکەنی فێر بە، چەقەنەی مەلا سمایلی فێر بە. لۆتیەتی

فێر ببە، چاك مەیموون هەڵپەڕێنە. هەموو جار ئەمانەت پێ ئەڵێم هیچ بەگوێم ناكەی. ئەمە ئاخر جارە پێت ئەڵێم، ئیتر لە تاقەتما نەماوە، ئەگەر بەگوێم نەكەیت ئەتخەمە بەر خوێندنی مەلا! بۆ ئەوە ببی بە عالم و زانا؛ ببی بە شاعیر و دانا. ببی بە فەیلەسووفێكی توانا، ببی بە پارچە گەوهەرێكی درەخشان لە هەموو هونەرێكا. بەڵام شێوی شەوت نەبێ بیخۆی و كەسیش پێت نەڵێ: كەرت بە چەند!.

١٤٥. «هێمن»ی شاعیر بۆی گێڕامەوە وتی: كوڕێكی زیرەك هەبوو لەو سەرە لەگەڵ دەستەیەكی ڕەفیقیا جارێك خەریكی شەراب خواردنەوە و كاغەزبازی بوون. خەبەریان بۆ هێنا وتیان: باوكت مرد. وتی: هەموو كەس ئەمرێت. وتیان كەوتۆتە ناو بیری ناو حەوشەكەتانەوە، ترنجاوەتە ناویەوە دەرناچێت. وتی: ئەو بیرەی ماڵی ئێمە خۆم ئەیزانم شێریش بكەوێتە ناویەوە تیایا ئەترنجێ و ئەمرێ؛ ئێستە ئەو چۆن تیایا نامرێ؟ دەستیشی هەر بە كاغەزەكانەوەیە و كاغەز فڕێ ئەدا، دڵی نایە كۆڕەكە بەجێ بێڵێ.

وتیان: بچۆ دەری كە. وتی: وەختی خۆی من نەمئەتوانی لە شوێنی خۆی بێ جووڵێنم، ئێستە چۆن ئەتوانم كە ترنجاوەتە ئەو بیرەوە دەری كەم؟. وتیان: باشە، ئێمە دەری ئەكەین لە بیرەكە، بەڵام لەگەڵمان وەرە با بچین كفن و دفنی كەین و بێنێژین. وتی: مردووشۆر هەیە خۆ من نایشۆم، بچن بیهێنن ئەو ئەیشوا. ئەگەر زێڕ و زیویش بێ من بڕوا بە ئێوە ئەكەم بچن بێنێژن منی ناوێ!.

١٤٦. حەمەبەگی حاجی ڕەسوول بەگ گێڕایەوە وتی: لە تاریەر عێل سەرەوژوور ئەبوونەوە بۆ كوێستان، دوو سواری بناری هەڵەبجە

بەویدا تێ ئەپەڕن تەماشا ئەکەن وا دوو کوڕی عەشیرەتی کەماڵەیی چاڵێکیان هەڵکەندووە پیاوێکی ڕیش سپی خەریکە نان و ماست ئەخوا. کوڕەکانیش بەلایەوە قنیچکەیان کردووە و سەیری ئەکەن. سوارەکان ئەپرسن لە کوڕەکان ئەڵێن: ئەمە چییە؟ ئەوانیش وتیان:

برا ئەمە باوکمانە. پیر بووگە، بۆمان ناگاتە کوێستان. عێل خرەی کرد چوو؛ ئێمە بەجێ ماگین وە لایەوە. نان و ماستمان بۆ دانیاگە بیخوا. ئەو چاڵەشمان بۆ هەڵکەندگە کە نان و ماستەکەی خوارد بیخەینە چاڵەکەوە دایپۆشین با قەل و داڵ لەم چۆڵەوانیەدا نەیخوا. خێرا ئێمەش بچین وە شوێن عێلدا بیانگەینێ.

پیاوەی هەژاریش وا هەر خەریکە ملچەملچ نان و ماستی خۆی ئەخوارد و بزەبز سەیریان ئەکا نازانێ دنیا چ باسە.

وتی: وتمان کورە هەی زۆڵینە ئەمە ئێوە چی ئەکەن؟ ئەوانمان دایە بەر قۆناخە تفەنگ دەرمانکردن و پیاوەکەمان خستە پاشکۆی خۆمان هێنامانەوە بەخێومان کرد تا عێل گەڕایەوە بۆ شارەزوور. هەتیوەکان هاتن باوکەکەیانمان پێ دانەوە هەتا چەند ساڵێ دوای ئەوە هەر ما و پاشان عەمری خوای کرد!.

**١٤٧.** ئەوڕەحمانی خامە لە سولەیمانی جارێك بۆ نوێژی نیوەڕۆ ئەچێتە مزگەوتی «خومخانە» بۆ نوێژکردن. ئەچێتە سەر ئاودەستەکە و دێتە دەرەوە و دەعباکەی ئەگرێ بە دەستیەوە لەبەر ئاودەستەکەدا ئەگەڕێ و ئەکۆکێ و هەر جارە ئەیسوێ بە دیوارەکەدا.

ئەمە بە ڕاوێژی ئەو نوێژکەرانە کە پیر ئەبن ئەڵێن: «استبراء».

وەستا گوروونیش هەر بۆ نوێژ ئەچێتە ئەوێ. کە ئەبینێ ئەوڕەحمان وا ئەکا پێی ئەڵێ: کاکە ئەوڕەحمان دیوارەکەت کون کرد، دە واز بێنە.

ئەویش ئەڵێ: وەستا گوروون بەو سەختی و ڕەپییە نەماوە کە تۆ چاوت پێ کەوتبوو!.

١٤٨. حاجی حسێنی کانیکەوەیی هەبوو لە سولەیمانی ماڵەکەی نزیکی مزگەوتەکەی حاجی مەلا ڕەسوول بوو. قاپی حەوشە و بانی ئەو سەردەمەی سولەیمانی هەموو شەق و شڕ بوو. حاجی حسێن هێشتا حەجی نەکردبوو. حاجی مەلا ڕەسوولیش مابوو. شەوێك دز دێت دەرگا شەقوشڕەکەی ماڵی حاجی حسێن ئەدزێ. دەرگا بە کەڵکی هیچ نەدەهات، بەڵام لەبەر ئەوە دنیا زستان و سارد بوو بۆ سووتان باش بوو. ئەویش شەوی دوایی ئەچێ دەرگای مزگەوتەکەی حاجی مەلا ڕەسوول ئەگرێ بە کۆڵەوە و ئەیهێنێ لە شوێن دەرگای حەوشەکەی خۆیانی دائەنێ. ماڵەکە ڕاست بەرانبەری مزگەوتەکە بوو. بەیانی حاجی مەلا ڕەسوول ئەچێ بۆ مزگەوت، سەیر ئەکا دەرگای مزگەوت نەماوە و وا بە ماڵەکەی حاجی حسێنەوە. ئەچێتە لای حاجی حسێن ئەڵێ: بۆچ ئیشی وات کردووە و دەرگای ماڵی خوا چۆن ئەبەی؟ ئەویش ئەڵێ:

حاجی مەلا ڕەسوول دز قاپی حەوشەکەی منی دزیوە، خوا دزەکە ئەناسێ؛ بیدا بە دەستمەوە و قاپی ماڵی خۆی بەرێتەوە!.

١٤٩. ئەحەی کرنوو نەخۆش ئەکەوێ. ئەو سەردەمە حەکیمێك لە سولەیمانی ئەبێ ئەچێتە لای حەکیمەکە دەرمانێکی بداتێ و چارێکی بکا. حەکیمەکە لە پاش تەماشاکردنی ئەڵێ: خاڵەحەمەد تۆ لە دڵ خاڵیەتییەوە وات لێ هاتووە، ئەگەر دڵت تۆزێ هێزێکی تێکەوێتەوە چاك ئەبیتەوە. دەرمانەکەشی ئەوەیە بێنی تا سێ ڕۆژ هەر ڕۆژێ دوو جار بەیانی و ئێوارە دوو فرووجی سوورەوەکراو، دوو شلکێنە بە ڕۆن، چوار

هێلکە بە مێخلەمە بخۆی و کاسەیە فرنی بکەی بە سەریا، پاشان هێڵنج بدەی بڕشێیتەوە تا سێ ڕۆژ ئەمە بکەی ئیتر چاك ئەبیتەوە. ئەحەی کرنوو تۆزێك ڕائەمێنێ و ئەڵێ:

حەکیم باشی! ئەوە تۆ بە ڕیشی خۆت پێ‌ئەکەنی یا بە ڕیشی من؟ ئەوانەی تۆ ئەفەرموویت ئەگەر یەکێکی‌تر بیخوا و بڕشێتەوە من بە سینەباز ئەیقۆزمەوە!.

١٥٠. مەلا حەسەنی قازی خۆی گێڕایەوە وتی: ئەوا قازین لە چوارتا؛ ژنێك دەستی پیاوێکی گرتبوو هاتنە لام. ژنە وتی: قوربان جەنابی قازی! ئەم پیاوە مێردمە، ئەمەوێ تەڵاقم بدا و لە کۆڵم بێتەوە. وتم: دایکم تەڵاق شتێکی باش نییە. بۆچ تەڵاقی لێ وەرئەگری. پاش ئەوە ئەگەر تۆ داوای تەڵاق بکەی هەموو حەق و حوقووقێکت ئەڕوا. ژنە وتی: قەبووڵمە. وتم: ئاخر لە بەرچی وا وەڕز بوویت، نەفەقەت ناداتێ؟ چییە؟ وتی: قوربان نەفەقەم ئەداتێ، بەڵام... وتم: دە دایکم قسە بکە. ژنە وتی: قوربان شەرع شەرمی بۆ نییە، شەوێ دە دوانزە جار هەڵئەستێتە سەرم. من تاقەتی ئەوەم نییە.

وتی: ئەمەم بەلاوە سەیر بوو. پیاوەش هیچ دەنگ ناکا. وتی: ڕێکم خستن لەسەر ئەوەکە شەوێ پێنج جار ئیشی شەرعی بکەن و لەوە زیاتر نەبێ. ژنە ڕازی بوو. پیاوە هەڵیدایە وتی: قوربان پرسیاری لێ بکە ئەگەر پێویستم بە بەرکۆڵ و قەرز هەبوو ئەمداتێ؟ ژنە بەمەش ڕازی بوو. لە پاش سێ ڕۆژ، ژنە هاتەوە وتی: قوربان نەجاتم بدە لە دەستی. وتم: چی بووە؟ وتی: بە سێ شەو بەرکۆڵ و قەرزی شەش شەوی لێ سەندگم. نایتوانم، ئەم قەرزەی لەکوێ پێ ئەدرێتەوە.

◈◇◈

## فەرهەنگی تەمەڵ

حەکیم: چەپەری مردن.

جەهلی مورەکەب: دوو سۆفی لە یەك شوێنا.

دەرووی بەرەحمەت: لەفزی سێ تەڵاقە

بەدبەخت: ئەو کەسەیە کە بە دەست کچەوە گیری خواردبێ.

ماچ: دەڵاڵی ئەو شتەکە.

خێرخوا: ئەو کەسەیە کە پیرێژنێك بە وانێکێك بلاوێنێتەوە.

ڕەسووڵ: خێرخوای دوژمنان.

خاوەن پایە: دوژمنی هەموو کەس.

سەردار لەشکر: پەتی گەسك.

فەقێ: هەر برسی.

چەپەر: خزمەتکاری خۆڕایی.

پیاوی ئازا: بە پیر مردنەوە چوو.

داستان‌نووس: پشیلەی مڵاز لە کونی مشك گرتوو.

نەخۆش: سەرمایەی دوکتۆر.

بەلاجەوی: لۆتی نوێژکەر.

واعز: ئەوەی بیڵێت و نەیکات.

خۆشبەخت: کەسێکە کە هەرگیز ڕووی حاکم و حەکیم نەبینێت.

ژیری: هەگبەی هەموو جۆرە باس و خواسێك.

خاوەن ئەقڵ: ئەو کەسەیە کە ئەقڵی گوزەران و ژیانی نییە.

خوڵام: ژنی نەزۆك.

دێوانە: ڕێگر.

مەلازادە: کتێب فرۆشی بە هەرزان و تاڵان.

ئەولاد: خۆشی دڵ و ئازاری گیان.

بێ مەزە: وشکە مەعرفەت.

بێ خەم: ئەو کەسەیە کە هەر بە کۆڵانانا بە هیچوپووچ ئەسووڕێتەوە.

کەروێشك: لەشکری شکاو.

سەرگەردان: لووسکەی بێ مشتەری.

بەرتیل: گێڕی ئوتۆمۆبێل.

هاوشاری: کەسێکە کە هەر لە باوباپیریەوە عەیبی یەکێکی‌تر هەر لە باوباپیریەوە ئەزانێ.

مورتەد: برا لە ماڵی خوشکدا.

دڵتەنگ: باوك لە ماڵی کچدا.

ناچار: قەرزار.

ئەکابر: بەنگکێشی پەنامەکی.

هیچ: وەڵامی ئیشی خراپ.

زستان: ئاوی کەپوو.

هاوین: کێری درێژ.

«فاتحە»: سەرمایەی دەرۆزەکەر.

«بسم الله»: ئەگەر تێری، مەخۆ.

باوەحیز: ئەو کەسەی لە نیشتمان هەڵدێت.

ماچ: دیسان بەرکوڵی وانێکەکە.

تەوبە: پشتیوانی گومڕاهان.

حافزی قورئان: گۆیندەی خوا.

شکات: بێزاری لە دۆستە کۆنەکان.

فەلاکەت: ئەنجامی زانیاری.

پیسی: شتێکە لە هەنگوین شیرینتر بێ.

پارەدار: بێ ئیشتها.

«مُتوکّل»: چاو لە دەرگا.

داخدار: باوکێ بە ناوی کوڕەوە ناو دەرکا.

مردووشۆر: ئەو کەسەیە کە کێرێك ئەشوا هەڵناستێ.

هەر بەڕۆژوو: وانێکی پیرێژن.

خوانی یەغما: ئەو کوڕەیە کە ئەکەوێتە بەرپەلی ئاغەگەلی هەتیوباز.

١٥١. خەلیفە حەمەساڵح هەبوو لە سولەیمانی خەلیفەی ماڵی شێخ بوو. ڕۆژێك خۆی کۆ ئەکاتەوە و ئەچێ بۆ زیارەتی ماڵی شێخ. شەوێ ئەچێتە دێی تەڕەمار و ئەچێتە مزگەوت. بە ڕێکەوت بەچکەدەروێشێکی جوانکەلەش لەوێ ئەبێ. خەلیفە حەمەساڵح مرخی لێ خۆش ئەکا.

فەقێکان هەست بەمە ئەکەن. لە نیوەشەوا ئەچن بە هێواشی بەچکەدەروێش لە شوێنەکەی خۆی هەڵئەگرن ئەیگوێزنەوە بۆ لایەکی‌تر. مجەورێکی گۆن لەوێ ئەبێ کە ڕقیان لێ ئەبێ ئەو ئەخەنە شوێنەکەی. خەلیفە حەمەساڵحیش ئاگای لەمە نییە. لە پاش نیوەشەو ئەچێتە لای کابرا و لێی توند ئەکا. کابرا هاوار ئەکا یاغەوسی گەیلانی! خەلیفە حەمەساڵح ڕائەچەنێ و ئەڵێ: من یاغەوسی گەیلانی، لە قوزی دایکی ئەو کەسە بەم تۆی خستۆتە شوێنی ئەو!.

١٥٢. شێروان عەلی ئەمین گێڕایەوە وتی: لەم سەردەمانەی دواییەدا تەنەکەچییەك هەبوو لە سولەیمانی وەستا فەتحوڵڵای ناو بوو. ڕۆژێك کابرایەکی عەرەب ئەچێتە لای داوای «لەوح»ی لێ ئەکا. ئەویش

هیچی لێ تێ ناگا. لە عەرەبیشدا تەنها وشەی «یابە» ئەزانێ و هیچی‌تر. کابرای عەرەبیش لە وشەی «کاکە» بەولاوە هیچی‌تر نازانێ. کەچی هیچیان لە هیچیان تێ‌ناگەن. لە ئەنجاما وەستا فەتحوڵڵا دەستی بەرز ئەکاتەوە دەست ئەکا بە پڵتۆك لێدان و بە دەمیش ئەڵێ: «یابە هەی لنگ لنگ و دنگ دنگ هەیە دنگ دنگ».

کابرای عەرەبیش نە لە لنگ‌لنگ و دنگ‌دنگ تێ‌ئەگا نە لە پڵتۆك لێدانەکەی؛ پێی ئەڵێ: «شتگول». ئەویش وەکوو بەڕوی لە دەما هەڵتۆقیبێ بە کوردی پیا دێت ئەڵێ: لەوحەکان دوو جۆرن، جۆرێکیان تەنکن کە پڵتۆکی لێ ئەدەی دەنگەکەی دەنگ ئەداتەوە و زینگەی لێوە دێ، ئەڵێ: لنگ لنگ لنگ؛ جۆرەکەی‌تریشی ئەستوورە کە پڵتۆکی لێ ئەدەی دەنگەکەی ئەڵێ: دنگ‌دنگ‌دنگ؛ جا جەنابت کامیانت ئەوێ؟

کابرای عەرەب لەم فەرمایشانە سەری سڕ ئەمێنێ و دەمی ئەبێ بە تەڵەی تەقیوە و لێ ئەدا ئەڕوا؛ چونکە لە هەوەڵەوە لە لنگ و دنگ تێ‌نەئەگەیشت. ئێستە ئەم ڕیس و گوریسەشی هاتە سەر هەر بە تەواوی سەری لێ تێك چوو!.

١٥٣. محەمەد ئەردەڵان حاکم بوو لە هەڵەبجە. لەو سەردەمە ژنی هێنابوو لە پشوودا بوو. میرزا غەفوور هەبوو هەر لەو سەردەمەدا و هەر لە هەڵەبجەدا، پیاوێکی کوردی جافی لابوو ناوی «براحەمە» ئەبێ، ئەینێرێ بۆ بازاڕ نازانم چی بۆ بکڕێ. کەچی لەبەر ئەوە کە زۆر کەس لە ئەهلی بازاڕ لەو وەختەدا لە بانگێشتنی ئاهەنگەکەی محەمەد ئەردەڵان ئەبن دووکان کەمتر هەبوو. براحەمە شتەکەی بۆ ناکڕێ، بە دەستی خاڵی ئەگەڕێتەوە و ئەڵێ: بازاڕ چۆڵ بوو حوکمەت ژن دێنێ.

١٥٤. پیاوێکی خوابیامەرز هەبوو لە سەردەمی حوکمەتی عوسمانیدا کاربەدەستێکی تۆزێ گەورە بوو. حوکمەتی عێراق دامەزرا پلەیەك لە ئیشەکەی هاتە خوارەوە. هەر چەند ساڵێ پلەیەکی‌تر ئەهاتە خوارەوە، هەتا هاتە سەر میرزا «کاتب»، بە ئیستلاحی ئەم دەورەیە. چووە لای شێخ سەلامی شاعیر پێی وت: تۆ کەینوبەینت لەگەڵ ئەمین زەکی‌بەگدا هەیە و ئەویش ئێستە وەزیرە و لەسەر ئیشە، بەڵکوو بمبەی بۆلای پێی بڵێیت پلەیەك سەرم خەن و لەسەر ئەم کاتبیە لام دەن.

شێخ سەلامیش ئەڵێ: باشە و لەگەڵ خۆی هەڵیئەگرێ ئەیبات بۆی لای ئەمین زەکی‌بەگ. ئەچن و دائەنیشن و پاشان بە ئەمین زەکی‌بەگ ئەڵێ: قوربان! ئەمە فلانە کەسە و دراوسێی خۆمانە. هەر لە کۆنەوە کاربەدەست بووە. هەر ڕۆژە نا ڕۆژێك پلەیەك هێناویانەتە دواوە. ئێستە هاتۆتە لای من کە بیهێنم بۆ خزمەتت بۆ ئەوە بە هەرجۆر بووە بەڵکوو ئیشێکی وا بکەن پلەیەکی‌تر بیهێننە خوارەوە و بیکەن بە فەڕاش!.

کاکی خوا بیامەرز کە گوێی لەمە بوو هەر لەوێدا بەربووە جنێودان و قسە وتن بە شێخ سەلام: هەی ناجسن! من تۆم بۆ ئەوە هێناوە کە بمکەی بە فەڕاش یا سەرم خەی؟

شێخ سەلامیش تێی بەربوو وتی: هەی ناجسنی ماڵ وێران! تۆ ئەوەیتە هەروەکوو میزی حوشتر هەر بەرەو دوا ئەگەڕێیتەوە، تازە ئەتەوێ سەرکەویتەوە؟ هیچ شتێکی‌تر نەماوە بتکەن بەوە تەنها فەڕاشی نەبێ. من وتم: بتکەن بە فەڕاش و ئیتر دوای ئەوە هیچی‌تر نامێنێتەوە کە بتکەن بەوە، بۆ خۆت ڕزگارت ئەبی!.

ئەمین زەکی‌بەگیش بەم کارەساتە پێکەنین ئەیگرێ و لام وایە ئیشێکی بۆ خوابیامەرز کرد.

١٥٥. لە گوندی «وەرتێ» لەو خۆشناوەتییە خەڵکەکە کۆ بوونەوە وتیان: بچین بۆلای میر بۆ دیدەنی و ئەبێ دیاریشی بۆ بەرین. هاتنە سەر ئەوەکە «نێری»یەکی بۆ بەرن. بەڵام «حەچە» بەبێ دەستنوێژ بچێتە خزمەتی میر نابێ. هێنایان خستیانە حەوزێکەوە و لە ئاوەکەیان هەڵئەکێشا. هەرکە دەریان ئەهێنایەوە «نێری» خۆی ڕائەوەشان بۆ ئەوەی ئاوەکە لە خۆی بتەکێنێ ترێکی ئەکەند. ئەیانوت: پەککو، دەستنوێژەکەی شکا! بە هەرجۆر بوو دەستنوێژیان پێ گرت و ترکەندن دوایی هات. بردیان بۆ میر و میریش سەروجووت کەوشی سووری بە خەڵات دانێ و گەڕانەوە.

لە گەڕانەوەدا هەموو لەسەر تاشەبەردێك دانیشتن و قاچیان شۆڕ کردەوە سەیری کەوشەکانیان ئەکرد. پاشان سەریان لێ تێك چوو، نەیانزانی کامە قاچی کامیانە تا هەڵیکێشنەوە هەروا ڕەپ لەوێ مانەوە و ڕۆژ درەنگ بوو. لە ئاوایی چاوڕێیان ئەکردن. لە ئەنجاما هاتن بە دەنگیانەوە سەیریان کرد هەموو لەوێ وشك دانیشتبوون و قاچیان ڕاکێشاوە. ئەوانیش سەریان لێ تێك چوو، نەیانزانی چۆنیان هەڵسێنن.

ئەمجا «مامۆتك» هات دارێکی هەڵگرت یەکەیەکە ئەیدا لە قاچیان، دیارە ئێشی پێ ئەگا قاچی ئەجووڵانەوە. مامۆتك ئەیگرت و بەخاوەن قاچی ئەوت: ئەوە قاچی تۆ. ئەویش هەڵی ئەکێشایەوە و ئەڕۆیشت. کە هەموو ڕۆیشتن وتیان: «ئەگەر مامۆتك نەبوایە ئێمە لێرەدا هەموو ورچ و دەعبا ئەیخواردین!».

١٥٦. هەر لە گوندی «وەرتێ» دوو کەس هەڵئەستن ئەچن بۆ ڕاوەمێش (مەگەز)! گەلێك ئەسووڕێنەوە هیچیان دەست

ناکەوێ. لە ئاخرا لەسەر کانیهیەك دائەنیشن، کوتوپڕ مێشێك ئەنیشێ بە ناوچەوانی یەکێکیانەوە. ئەوەی کە مێشەکەی بە ناوچاوەوە نیشتۆتەوە بەبێ ئەوە قسە بکا «فیتۆیەك» بۆ کابرای هاوڕێی دائەهێڵێ و بە پەنجە ئیشارە ئەکا بۆ ناوچەوانی خۆی و ئەڵێ: ئەوە مێشێکە بیکوژە.

کابرای هاوڕێی فیشەك ئەخاتە بەر تفەنگ و تەقەگوللەیەك ئەنێ بە ناوچەوانی کابراوە و ئەیکوژێ. دیارە لەو وەختەدا کابرا دەم و لێوی لێك ئەبێتەوە و ددانی دەرئەکەوێ. ئەمجا ئەویتر پێی ئەڵێ: ما گرەکەی ئەکەی؟ ما لێم نەدایە؟( یانێ: بۆچ پێئەکەنێ؟ بۆچی لێم نەداوە؟)

١٥٧. لە «وەرتێ» ئەڵێن: هەموو شت ئەچێنرێ چما خوێ ناچێنرێ؟ چەند کەسێك ئەچن خوێ ئەبەن ئەیپرژێنن بۆ ئەوە بڕوێ. پاش ماوەیەك ئەچنەوە بزانن شین نەبووە. دیارە هیچی دیار نییە. یەکێکیان بەردێك لەناو وەردەکە هەڵئەگرێ بۆ ئەوە بزانێ خوێکە چەکەرەی کردووە یان نە؟ بە ڕێکەوت دووپشکێك لە ژێر بەردەکەدا ئەبێ، بە چەکەرەی ئەزانێ. هەڵیئەگرێ و ئەیبا بۆ دەمی بۆ ئەوە بیچێژێ. دووپشك ئەدا بە سەری زمانیەوە ئەڵێ: پەککو، ماشەڵڵا چەند سوێر و تیژە! چ بڕان ناخورێ!.

## لە بارەی حاجی مەلا ڕەحمانی شەرەفکەندییەوە

١٥٨. هەژاری شاعیر گێڕایەوە وتی: جارێك سۆفییەك لە حاجی مەلا ڕەحمان ئەپرسێ: قوربان ڕیش هێشتننەوە لە شەرعا خێری زۆرترە؟ ئەویش ئەڵێ: جا سۆفی چی لەوە خێری زۆرترە؟ بەخوا لەو ڕۆژەوە من ڕیشم بەر داوەتەوە قوونم حەساوەتەوە. جاران ئەگەر جنێویان پێ بدامایە ئەیانوت: های لە قوونی بەم، ئێستە هەر دەڵێن های لە بن ڕیشی بەم!.

١٥٩. مەلا کەریمی گوڵ ـ کە «سوو» خۆرێکی بەناوبانگ بوو ـ مردبوو. لە خانەقای شێخی بورهان ناشتبوویان. کەسوکارەکەی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە لە حوجرەی شێخ محەمەد دانیشتبوون. حاجی مەلا ڕەحمانیش لەوێ بوو. کوڕەکەی مەلا کەریم کەوڵێکی زەردی باوکی خستبوە ناو بوخچەیەکەوە لە بەردەمی شێخ محەمەد داینا وتی: قوربان باوکم وەسیەتی کردووە ئەم کەوڵە بۆ جەنابت بێ. منیش وا ئێستا هێناومەتە خزمەتت. شێخیش لەبەر ئەوە کە مەلا کەریمی ئەناسی و ئەیزانی ئەم کەوڵە لە پارەی سوو پێکەوە نراوە، بە حەرامی ئەزانی، نەیویست. وتی: ڕۆڵە من پیر بووم و تاقەتی کەوڵ لەبەر کردنم نەماوە. لەبەر ئەوە نامەوێ.

کوڕ و کەسوکاری مەلا کەریم وتیان: قوربان یا ئەبێ لێمان وەربگری یا ئەبێ بمانکوژی؛ نابێ وەسیەتی ڕەحمەتی بشکێ. شێخیش وتی: باشە وەری ئەگرم. ها حاجی مەلا ڕەحمان با بۆ تۆ بێ. ئەویش وتی: بێنە قوربان باشە با بۆ من بێ، میراتی کەر بۆ کەمتیارە!. ئیتر کەس نەما لەبەر پێکەنین؛ تەنانەت کەسوکاری مردووەکەش.

١٦٠. شای ئێران عەسایەکی بە خەڵات دابوو بە حاجی بابەشێخی جەمیان کە سەرەکەی جەواهیرات بوو. شەوێك دز ئەچێتە ماڵی حاجی بابەشێخ گەلێ شت ئەدزن. لەگەڵ شتەکانا سەرەعەساکەش ئەدزن. ئەو شەوەش حاجی مەلا ڕەحمان لە جەمیان ئەبێ. بەیانی ئەگەڕێتەوە بۆ «قەرەگوێز» لێی ئەپرسن: ئەرێ حاجی مامۆستا ماڵی بابەشێخیان زۆر دزیبوو؟ ئەویش ئەڵێ: «ئەرێ وەڵڵا، بابەلێ سەرە عەساکەشیان لێ بردبوو!».

١٦١. ڕۆژێـک ئەحمەدئاغـای قاقڵاوا (کـە سـەگە نێریشـیان پـێ ئەوت) لە زەمبیل ئەبێ. حاجی مەلا ڕەحمانی شەرەفکەندی لێی ئەپرسێ: ئەرێ ئاغا بیستوومە ئەتەوێ قاقڵاوا بفرۆشی و بچیتە ناو گەورکان؟ خۆ قاقڵاوا زۆر خۆشە بۆ ئەوە ئەکەی؟ ئەویش ئەڵێ: بەخوا قوربان فێری ناو چۆم و ئاو نەبووم و لێی ناژیم.

حاجی مەلاش وتی: جارێك کابرایەك بەناو بازاڕی عەتارەکانا ئەڕوا، لە پڕ ئەکەوێ و لە هۆش خۆی ئەچێ. حەکیمێکی بۆ دێنن. حەکیم هەرچەندە خەریکی ئەبێ کابرا چاك نابێتەوە. پاشان ئەپرسێ: ئەم کابرایە ئیشی چی بووە؟ ئەڵێن: لە دەباغخانە ئیش ئەکا. ئەویش هەر گورج دەرپێکەی دائەکەنێ، تەپێ گوو لە بەر لووتی کابرادا ئەکا. کابرا هەر بۆگەنەکە ئەچێ بە لووتیا پژمەیەك ئەدا و ڕاست ئەبێتەوە. بەڵێ، پیاو کە فێری شتێك بوو زۆر سەغڵەتە دەستی لێ هەڵگرێ.

١٦٢. حاجی سەعیدی مەلا حەسەنی عەلاف بۆی گێڕامەوە وتی: لەگەڵ مەلا حەمەمینە شێتە لە سولەیمانی بڕیارمان دا کە حەمووشاغا بچێت دایکی خۆی لێی مارەکا. حەمووشاغا ئێمەی هەڵگرت و چووینە لای مەلا حەمەمین پێی وت:

مەلا حەمەمین من دایکم هەرچەندە پیرە بەڵام جوانە. ژنێك دێنێ، ئەمەوێ لێتی مارە کەم؛ چونکە لام وایە شتی شەرعی ئەوێ. ژنێکیش کە ئەوەی ویست بە شەرع دروست نییە لە ماڵا بمێنێتەوە. تۆیش خۆت ئەزانی، ئەمە بۆ نان نییە چونکە من دەوڵەمەندم و نانم زۆرە. بۆ نان بە دەست دایکمەوە دانەماوم، بەڵکوو ـ شەرع شەرمی بۆ نییە ـ بۆ گانە.

مەلا حەمەمینیش وتی: باشە، مادام شتەکە بە ئەمری شەرعە منیش

سەرم لە بەردەمیایە. حەمووشاغا وتی: ئاخر وا نابێ، ئەبێ قەوڵ و قەرارێك هەبێ لە بەینا. مەلا حەمەمین وتی: قەوڵ و قەراری چی؟ حەمووشاغا وتی: حەفتەی چەند جار ئەو ئیشە شەرعییە ئەبێت؟ مەلا حەمەمین وتی: حەفتەیەك جارێك. حەمووشاغا وتی: کەمە. مەلا حەمەمین وتی: بابە حەفتەیە دوو جار.

مەسەلە لەسەر ئەمە بڕایەوە و پێنج دینار بەیعمان لە مەلا حەمەمین وەرگرت. لەوە زیاتری پێ نەبوو. حەمووشاغا وتی: ئەمە نابێ، من کەفیلم ئەوێ. ئەگەر حەفتەیە دوو جار نەبوو، من چی جوابی دایکم بدەمەوە؟ قەرارمان دا بچینە لای حاجی برایماغای خەفاف ئەو ببێ بە کەفیل. مەلا حەمەمینیش ڕازی بوو، وتی: باشە.

چووین بۆلای حاجی برایماغا و کارەساتەکەمان بۆ گێڕایەوە، وتمان: ئەوا هاتوین جەنابت ببی بە کەفیلی مەلا حەمەمین. حاجی برایماغا وتی: زۆر باشە، بەڵام با مەلا حەمەمین ئەوە بزانێ کە مەعنای کەفالەت ئەوەیە: ئەگەر ئەو، ئەو ئیشەی پێ نەکرا ئەبێ من بیکەم.

لێرەدا مەلا حەمەمین تووڕە بوو دەستی کرد بە جنێودان بە هەمووماں وتی: ئێوە ئەتانەوێ بە هەمووتانەوە شەرەفی من بشکێنن و عەرزە و ناموسم لەناو بەرن. من ئەمە ناکەم هەر خۆم ئەبم بە کەفیلی خۆم. حەمووشاغا وتی: دەسا وەڵڵا مەلا حەمەمین من بەبێ کەفیل شتی وا ناکەم و ناتکەم بە زاوای باوکم؛ بڕۆ خوات لەگەڵ!.

١٦٣. حەمووشاغا ئەکەوێتە بیرێکەوە. حاجی حەسەنی خەفاف دەری دێنێ. پاش ئەوە ئیتر هەموو جار ئەیکوتایەوە بە چاویا. ئاخری ڕۆژێك پێی ئەڵێ: حاجی حەسەن کەم بیکوتەوە بە چاوما، وەرە تۆ بچۆ خۆت بخەرە بیرێکەوە، نان و کەبابێك ئەکرم بۆ قادراغای

عەبدولفەتاح بێت دەرت بێنێ. ئەو وەختە هیچمان لە هیچ. تەنها ئەوە نەبێ تۆ نان و کەبابێك قەرزار ئەمێنیتەوە.

١٦٤. عەبەی حەمەخەیات لەگەڵ حەمووشاغا وەختی خۆی لای حاجی عەبدولوەفا بوون. پاشان عەبەخەیات بوو بە حاجی و دەوڵەمەند بوو. ڕۆژێك ئەچنە لای حەمەسەعید خەفاف، حەمووشاغا بە حەمەسەعیاغا ئەڵێ: ئاغا بۆی بنووسە یەکێ لە حەجەکانیم بۆ حەواڵە بکا، بەڵام حەجی دووهەم و سێیەم نەبێ، چونکە پارەی ئەوانەی بە مووشێن پەیدا کردووە.

## لە قسەی هاوچەرخان:

١٦٥. بەگە میران هەبوو، ڕۆژێك لە هەولێر لەگەڵ «مُعلّم»ـێکدا ئەبێ بە شەڕیان و شەڕەکە زل ئەبێ. پاشان بە موعەللمەکە ئەڵێ: سەگباب! تۆ کوو لەگەڵ من شەڕ ئەکەی؟ من ژنەکەم موعەللمە هەموو شەوێ جارێك سواری ئەبم!.

١٦٦. محەمەد شەریف بۆی گێڕامەوە وتی: لەو وڵاتە دوو برا هەبوون، پیرداود و پیرمەم. پیرداودیان وا دیار بوو هەر لە سەرەتاوە دەعباکەی ئیشی نەئەکرد؛ بە کوردی هەڵنەئەستا. لەم ڕووەوە دائیما ماتەمبار و بە پەژارە بوو، ناهەقیشی نەبوو، چونکە بێبەش بوو لە بەشێکی زۆر گەورەی ژیان.

شەوێك دنیا زۆر سارد بوو، بەڵکوو بەفر و کرێوە بوو. هەردووکیان پێکەوە لە باخەڵی یەکا نوستبوون. لە نیوەشەودا پیرداود دەستی بە دەعبا کەوت سەیری کرد ـ بلامانێ ـ ڕاست بووەتەوە، گرتی و بە دەستەکەی تری دەستێکی ژەند بە پیرمەمی برایەوە وتی: برام خوا کردوویەتی وا دەعباکەم

ڕاست بووەتەوە، بەڵکوو بە هەرجۆر بووە بە پەلە یەکێکم بۆ پەیدا بکەی بچمە لای تا هەلم لە دەست دەرنەچووە! بەڵکوو ئەم تلیسمە بشکێ و ڕزگارم بێت لەو دەردە نەفسییە و بۆ خۆم لە پاشا ژنێك بێنم و ببم بە خاوەنی ماڵ و منداڵێك. پیرمەم وتی:

برام ئەمە قسەیە تۆ ئەیکەی؟ جارێ ئێستە بەم تۆفەیە ماڵەوماڵ هەر ناکرێ. ئەوا کراش، بەم دەمودەستە تا تۆ کێرت نەنیشتۆتەوە من ئەم یەکەم لەکوێ بۆ پەیدا ئەکرێ؟ سێیەم ئەو شتە کە تۆ گرتۆتە و بە هی خۆتی ئەزانی ئەوە هی برای خۆتە گرتۆتە!.

.١٦٧ ڕووپیە لە عێراق باوی هەبوو، دینار هات بە سەریا. کابرایەکی برین‌پێچ هەبوو لە هەولێر، پیاوێکی بەدیمەن و کەڵەگەت بوو. هەموو سەرشان و بەرۆکی خۆیشی پڕ کردبوو لە نیشان و جوققە. لە هەر شوێنێك دائەنیشت ئەو شوێنە چاخانە وەیا چێشتخانە بوایە پارەی دانیشتووەکان هەموو ئەو ئەیدا. لەم ڕووەوە حەماغایەك بوو بۆ خۆی.

جا لێیان ئەپرسی: کاکی خۆم! تۆ ئەم پیاوەتی و بەخشندەییە ئەکەی، مانگانەکەت چەندە وا بەم جۆرە ئەکەی؟ ئەویش خۆی نەئەشکان ئەیوت: من و ڕەئیسی «صحـە» پەنجاوپێنج دینار مانگانەکەمانە. بە مەرجێ مانگانەکەی ڕەئیسی «صحـە» پەنجا دینار بوو، هی ئەو پێنج دینار بوو. بەڵام وای بەلاوە گەورەیی بوو کە خۆی بخاتە پاڵ ئەو.

.١٦٨ مەلا جەمیل گێڕایەوە وتی: ئەوا لە کەرکووك دوو ژن نیشتوونەتە سەروبەچکی یەك و یەکتریان کەلەلا کردووە. لەو وەختەدا ئەوان بەو جۆرە لە شەڕدان ژنێکی لای ئێمە ـ ڕۆژبەیانی ـ کۆڵێ کنگری پێ ئەبێ ئەچێ بەلایانەوە ئەڵێ: خوشکم کنگر ناکڕن؟!

١٦٩. مەلا تۆفیقی حاجی برایم ناردی بۆ ڕشتە وتی: لەو دەشتی بازیانە لە گوندێ کابرایەکی سەپان ژنێکی جوان و جحێلی ئەبێ، لەگەڵ دایکێکی پیرا. ئەم ژنە دۆستێکی ئەبێ. بە دۆستەکەی ئەڵێ: شەو کە هاتی لەودیوی چەپەرەکەوە گوێ هەڵخە. ئەگەر ئامۆژگاریم کردی بەو پێیە بڕۆ بەڕێوە؛ ئەینا بگەڕێوە. شەوێك وا ڕێ کەوت مێردەکەی چوو بۆ سەر خەرمان. کاتێ کە دۆستەکەی دێ و دەنگی پێی دێت بەم جۆرە ئامۆژگاری ئەکات. بێشکەکە ڕائەژەنێ و ئەڵێت:

**ڕۆڵـە لای لایـە، ڕۆڵـە لای لایـە**

**باوکـت هەسـتاوە چووەتـە چیایە**

**پێخەفـی بردووە و ئەم شـەوە نایە**

**تـا بەیان ئـەڕوا هیچ دەنگـی نایە**

**ئەو سـەگەی ماڵمان ناوی زەنگینە**

**خەسووشم تۆزێ گوێچکەی سەنگینە**

**وا لـەلای چەپم بۆ خـۆی خەفتیە**

**بێشکەی کۆرپەکەش لای سەر کەفتیە**

**کە هاتیـە ژوورە و کۆڵەکـەی ماڵە**

**تـۆزێ لەملاتـر تەنـوورە و چاڵـە**

**خـۆت لادە لێیان بێرە لای ڕاسـتم**

**دەسـت بکەرە ملم هیچ مەکە باسم**

**ڕۆڵـە لای لایـە، ڕۆڵـە لای لایـە**

**دەردت لـە گیانم بـۆچ خەوت نایە**

بەم جۆرە و لەسەر ئەم نیشانانە کاورای دۆستی ئەچێتە لای ڕاستیەوە و تا بەیانی بۆ خۆیان پێکەوە ڕائەبوێرن.

١٧٠. بۆیان گێڕامەوە کە لە سولەیمانی لە گەڕەکی سەرچیمەن مەلا «کەرەموەیس» ناوێـك هاتبـووە ئـەوێ، پیشـەی هـەر کتێب گرتنەوە بوو لەگەڵ نوشتە نووسینا. ژنێکی زۆر ناشیرین و ناقۆڵای هەبوو ناوی «خاحەنیف» بوو. مەلا ئارەزووی لێ نەئەجووڵا لەبەر ناشیرینی. ڕۆژێ مەلا ئەچێ بۆ کتێب گرتنەوە لە کاتی نیوەڕۆدا دێتەوە بۆ ماڵەوە پاڵ بە دەرگاوە ئەنێ و ئەڵێت: حەنیف خێرا دایکەنە لە ماڵی باشچاوش ڕەقم کردووە هەتا نەنیشتۆتەوە.

حەنیف ئەڵێ: جارێ دەستم لـە هەویردایە. مەلا ئەڵێ: کچێ! کە نیشتەوە ماڵی باشچاوشێکیترم لە کوێ دەس ئەکەوێ ڕەقی کەمەوە؟!.

١٧١. دوو دێ هەیە لـەو موکریانـە، یەکێکیـان «سـەراو»ی ناوە، ئەویکەیان «بناو»ی ناوە. حەمەی یۆسۆجان هەبوو، پیاوێکی ئازا و بەدەسەڵات و لە جافەکان بوو. شکاتیان بردە لای حاجی برایماغای عەنبار بۆ ئەوە بۆیان ساغ کاتەوە.

ئەویش وتی: بیخەنە حەوزەکەی بۆکانەوە، ئەگەر کەوتە سەر ئاوەکە ئەوە هی سەراویەکانە، ئەگەر کەوتە بن ئاوەکە هی بناویەکانە. حەمەی یۆسوجانیش وتی: بەڕاستی ئاغا حوکمێکی چاکت کرد. لە هەردوو بارا من ئەخنکێم و تۆیش بە ئاقڵ دەرئەچی.

١٧٢. محەمەد مەلا شەریف بۆی گێڕامەوە وتی: لە گوندی «گۆمەشین» لەو خۆشناوەتییە مام ئەوڵا کچێکی هەشت ساڵانی هەبوو ناوی «خەجە» بوو. کوڕێکی برازاشی هەبوو داوای خەجەی ئەکرد کە مامی بیداتێ. خەجەش ڕاوەستابوو، مام ئەوڵاش ئەیوت: کوڕم زۆر مناڵە چۆن ئەبێ؟ خەجە لەو ناوەدا هەڵیدایە وتی: بەخودای بابە هیچ پەك لە

من ناكەوێ. مام ئەوڵای هەژار دەمی بوو بە تەڵەی تەقیووە ناچار دایە و ڕاستیش بوو خەجە هیچ پەكی نەكەوت!.

١٧٣. مەلاكەی گوندی «هێرۆ» كتێبێكی تەفسیری لە بەردەستا بوو موتاڵای ئەكرد. كتێبەكە دەستنووس بوو، بە خەتی گەورەو حاشیەی ورد و سوور نووسرابووەوە. سۆفی شەریفێك بەلایەوە دانیشتبوو؛ ئەویش سەری شۆڕ كردەوە بەسەر كتێبەكەدا و پەنجەی خستە سەر خەتە دروشتەكان وتی: مامۆستا ئەمانە ئەخوێنیتەوە؟ مامۆستا وتی: ئا. سۆفی شەریف وتی: ئای سەگ مەلا، ئەمجا پەنجەی خستە سەر خەتە وردەكان وتی: ئەم وردانەش ئەخوێنیتەوە؟ مامۆستا وتی: ئا. سۆفی وتی: ئای بەراز مەلا. وتی: ئەی ئەو سوورانە؟ وتی: ئا. وتی: ئای نێرەكەر مەلا. مەلاش وتی: بەسە بەسە سۆفی هەمووی ئەخوێنمەوە ئیتر هیچ نەماوە.

١٧٤. ئەحەی جاو جارێك زستان ئەبێ ئەچێ بۆ حەمامی موفتی لە سولەیمانی. كە دێتە دەرەوە لە دەرگای حەمام دەرئەچێ «با» لێی ئەدا یەكێ لە هێلكەگونەكانی چرچ ئەبێ و ئەچێ بە ناوا. ئەمیش ئەگەڕێ بەشوێنیا و ئەگەڕێتەوە بۆ حەمامەكە.

فەرەجی حەمامچی لێی ئەپرسێ: ئەوە بۆ گەڕایتەوە؟ ئەڵێ: ئەم حەمامە دزی تێدایە، یەكێ لە هێلكەگونەكانمیان دزیوە. لەم قسانەدا ئەبن هەوای گەرم لێی ئەدا هێلكەگون شۆڕ ئەبێتەو ەو دێتەوە شوێنی خۆی.

مامەحەمەد هەست بە قورساییەك ئەكا و دەست بۆ ناو لنگی خۆی درێژ ئەكا سەیر ئەكا هێلكەگون لە شوێنی خۆیەتی. ئەڵێ: فەرەج دۆزیمەوە شتێك كە دەستی دزی لێ نەكەوێ هەر ئەدۆزرێتەوە.

١٧٥. لالـە سـەرحەد لە دوایـی دوایی ژیانیا لەبەر ئـەوە چاوەکانی نەمابوو، کوڕەکانـی ئـەنارد بـۆ دزی، مەڕومالاّتیـان ئـەدزی و ئەیانهێنایـەوە، لالـەش کوڕەکانـی هـەر شتێکیان بهێنایە سـەری ئەبڕی و ئەیکرد بە خێر و خێرات.

لێیـان پرسـی: لالـە ئەمـە چـۆن ئەبـێ ماڵی دزێتی ئەکـەی بـە خێـر و خێـرات؟ ئەیـوت: ئێوە نازانن، جەزای خێرەکـە لەگەڵ کوناحی دزییەکە بەرانبـەر ئەوەسـتن، خێرەکـە گوناحەکـە دائەپۆشـێ، ئێمەش لـەو ناوەدا سەروپێ و ڕیخۆڵەکەمان بۆ ئەمێنێتەوە، بە حەلاڵی ئەیخۆین!.

١٧٦. «خا مەیرەم» هەبووە لەو سەرە سێ کچی جوانکەلەی هەبووە، کچەکان وەختی شووکردنیان هاتبوو، بەڵام لەبەر ئەوەکە تۆزێ سەری زمانیان ئەیگرت و «ك»ێیان ئەکرد بە «ت»ـێ خەڵك بۆ خواستنیان نەئەهاتنە پێشەوە و هەروا مابوونەوە.

بـە ڕێکـەوت یـەك دوو ئافـرەت جارێـك ئەچـن بۆ تەماشا کردن و خوازبێنییان. دایکەکەیان ئەزانێ ئەم ژنانە بۆ خوازبینی کچەکان هاتوون، تەمێی کچەکانی کرد کە بۆ خۆیان ئاقڵ دانیشن و هیچ نەیەنە قسە. بۆ نەگبەتی لەو کاتەدا مشکێ بە ژوورەکەدا تێپەڕی، کچی گەورە وتی: ئای خوشتێ ئەوە مشتێ بوو! دووهەم هەڵیدایە وتی: تەنی چووە تونەتەوە!. سێیەم دەستێکی بە زوڵفیا هێنا و وتی: بەخوا چات بوو شوتر من هیچ دەنم نەترد، ئەوە ئێوە بۆ تەوتنە تاوێژ تردن! خوازبێنیکەران کە ئەمەیان دی، دڵیان سارد بووەوە و بە پەشیمانی گەڕانە دواوە.

١٧٧. ئەحەی جاو جارجار ئەچوو بۆ دیدەنی شێخ بابەعەلی تەکیەیی لە مزگەوتەکەی خۆی لە سولەیمانی. شێخ حەمەعەلییەکی

باراوی هەبوو دووکانی بەقاڵی هەبوو لەسەر جادەکەی سابوونکەران، ئەچوو هەندێ مێوە و شتی بە قەرز لێئەکڕی و ئەیبرد بە دیاری بۆ شێخ بابەعەلی و پێکەوە ئەیانخوارد، پاشان شێخ حەمەعەلی داوای پارەکەی ئەکردەوە لە ئەحە. ئەحەش لووس و باریك دەستی ئەگرت و ئەیبرد بۆ لای شێخ بابەعەلی ئەیوت: پارەکەی بدەرێ!. بابەعەلیش ئەیوت: ئاخر ئەحە ئەوەت بە دیاری نەهێناوە بۆ من؟! ئەحەش ئەیوت: یا شێخ پارەکەی بدەرێ، ئاخر من نەمویست بە دەستی خاڵی بێم بۆ لات، ئەگەر ئەوەم نەهێنایە تۆ لە کوێ ئەو ترێ و شتەت ئەخوارد؟! شێخ بابەعەلیش دەستی ئەکرد بە پێکەنین و پارەکەی ئەدا بە شێخ حەمەعەلی.

**١٧٨.** حاجی محەمەدی عەنبەر یەکێك بوو لە نوکتەبێژەکانی سولەیمانی و لەو کەسانە کە قسەی نەستەقیان هەبوو، پێکەنینیش نەبوو. ئێوارەیەك کاتی نوێژی شێوان بوو لە مزگەوتی شێخ جەلاڵ لە سولەیمانی. ئەو وەختە ترومپایەك لەبەر سەکۆی مزگەوتەکەدا بوو، ئەم ئاوی بەلۆعە و مەلۆعەیە دانەهاتبوو. شێخ جەلال لەناو میحرابی سەر سەکۆکە قامەتی بۆ کرابوو هی نوێژی شێوان. خەڵکەکەش هەموو لە پشتیەوە ڕاوەستابوون.

نیەت دابەسترا و نەبەسترا کابرایەکی چەتەوڵی خەڵکی ئەو شارەزوورە هەر لە دوورەوە هات، تینووی بوو چووە سەر ترومپاکە ئاو بخواتەوە. هەرچەند بە دەوریا هەڵسووڕا نەیزانی چۆن ئەکەوێتە گەڕ. حاجی محەمەد لە سەفی پێشەوە لە نیوەی نیەتا بوو هەر خێرا دەرپەڕی بازی دایە خوارەوە چووە سەر ترۆمپاکە و بە کابرای وت: باوکم تینووتە؟ وتی: ئا، برا. وتی: دە دەم بنێ بە لوولەکەیەوە. دەمی نا بە لوولەی ترۆمپاکەوە

ئەویش دەستی دایە دەسکەکەی و خستیە جووڵە. تا ئەم ئەمەی کرد خەڵکەکە هەموو نوێژیان دابەست.

کە ئەو دەستی نا بە دەسکی ترومپادا ئاو باسقەنەی بەست، لە لووت و گوێی کابراوە ئاو دەرپەڕی. کابراش دەمی گیر بووە لە لوولەی ترومپاکە، هەرچەندە مل با ئەدا دەمی بەر نابێ. حاجی محەمەدیش هەر خێراخێرا دەسکی ترومپا بائەدا و ئاو هەر زیاد ئەکا و ئەڵێ: دە باوکم تێر بخۆرەوە.

خەڵکەکە لەناو نوێژەکەدا دەستیان کرد بە هیلکە هیلك و پێکەنین و هەموو نوێژیان بڕی. لەولاشەوە کابرا بە لادا هات. چەند کەسێك چوون دەسکی ترومپاکەیان لە دەستی حاجی محەمەد سەند ئاو وەستایەوە. بە هەرجۆر بوو دەمی کابرایان لە لوولەی ترومپاکە بەرەڵا کرد، دەستیان بە سکی کابرادا هێنا ئاوەکەیان لە سکی دەرکرد و کابرا بە هەرجۆر بوو هاتەوە هۆش خۆی.

حاجی محەمەد وازی نەهێنا چوو بەلایەوە پێی وت: باوکم تێرت خواردەوە؟ کابرا وتی: هەی دەویت باوك! ئەمە کەتن بوو تۆ وە منت گێڕا! وتی: برا چی بووە ئاوم دایت. یەکێ چووە شارەوە لوولە کەواوی خوارد، ئەی نابێ ئاو بخواتەوە؟ کابرا وتی: هەی بچۆ دەویت باوکەی شارییە! ڕیامە گۆڕ باوکتانا! شەرت وێ وە شەرتی خوا چوومەوە قسنەکەی سەی ساق بگرم باڵاتەرانتان بۆ بنێرێ هەزار شەقتان تێ هەڵدات و گشتتان گول بکا. بۆچی وا ئەزانن ئێمە بێ عەشیرەتین. کابرا ڕۆیشت و ئەوانیش نوێژیان دابەستەوە.

.١٧٩ مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵ هەبوو لە سولەیمانی. بەینی نیوەڕۆ و عەسر بوو، کابرایەکی شارەزووری هاتبوو بۆ شار. لە بازاڕ کەوایەکی کڕیبوو چووە سەر تاتەبەردەکانی مزگەوتی حاجی مەلا

ڕەسووڵ. کەوا شڕەکەی خۆی داکەند و ئەو کەوا تازەیە لەبەر ئەکرد. کەوا بەو تازەییە هەرچەندی ئەکرد ناوقەدەکەی نەئەهاتەوە یەك. توند توند ڕایئەکێشا و هەر ئەیوت: «یا غەوس! بکەم وە قنگ دایکتەوە وەسای خەیات بۆ کەوایەك پێت داگم».

ئەوەندە بە توندی لێی ئەنەوی زۆری لێ‌کرد، کەوا شیرەیەکی لێوە هات و دڕا. لەو وەختەدا کابرا ئەوەندە بە تین ئەینەوی لە ئەملاوئەولای کەواکە خۆیشی تڕێکی کەند. گوێم لێ بوو وتی: تڕ و شیرەی وە گۆڕ باوك خەیاتەکە! ئەم شارییە دەویت باوکانە ئێژی چوونە «بێسەلمێن» لادێیی وە کافر ئەزانن. وە شیرە ڕازی ناون، تڕیشیان گەرەکە.

.١٨٠ سەردەمی دەسەڵاتی شێخ مەحموودی حەفید لە سولەیمانی، [شێخ] لە حاجی مستەفا پاشای یاملکی توورە ئەبێ و ئەمر ئەکا بیگرن. حاجی مستەفا پاشا کە ئەزانێ ئیش زۆر خەتەرە و ئەگەر لەو وەختەدا بیبەنە لای، شێخ مەحموود ئەیکوژێ، دێتە سەر ئەوە خۆی بشارێتەوە. هیچ پەنایەك نادۆزێتەوە ئەوە نەبێ کە پەلاماری قورئانێك بدات و بچێت بۆ گردی سەیوان.

بە پەلەپڕووزێ قورئانێك هەڵئەگرێ و ئەچێ بۆ گردی سەیوان. لەو کاتەدا پیاوەکانی شێخ مەحموود ئەیبینن و هەڕا ئەکەن بەشوێنیا. ئەویش گورج لەسەر قەبرێك دائەنیشێ و دەست ئەکا بە قورئان خوێندن. پیاوەکان دێن ئەیگرن و ئەیبەن بۆلای شێخ مەحموود.

شێخ دەست ئەکا بە قسەکردن و پێی ئەڵێ: تۆ ئیشی نابەجێ ئەکەی و قۆمیتەت لە دژی من کردووە. ئەویش ئەڵێ: یا شێخ! بە قەبری دایکم من ئاگام لە هیچ نییە و بە تەواوی تەرکی هەموو شتێکم کردووە. ئەوە

لەو پیاوانە بپرسە بزانە منیان لەکوێ هێنا؟ من لەسەر قەبری دایکم بووم قورئانم بۆ ئەخوێند، حەقی زۆر بە سەرمەوەیە.

شێخ ئەم قسەیەی بەلاوە زۆر سەیر ئەبێ، چونکە ئەزانێ درۆ ئەکا. دایکی چی و قورئانی چی! لەگەڵ ئەمانەشا ئەڵێ: بڕۆ با خاتری قەبرە درۆزنەکەی دایکت بێ.

لە ڕاستیشدا قەبری دایك نەبوو، هەروا چووبوو لەسەر قەبرێك دانیشتبوو بۆ ئەو ڕۆژە کردبووی بە دایکی خۆی!.

١٨١. «عەزەشووکێ» هەبوو، جارێك ڕێی ئەکەوێتە ئەو ناو دزەیایەتییە ئەچێتە ماڵی حاجی سەلیم. ماڵی حاجی ساواریان ئەبێت. حاجی و عەزە پێکەوە دائەنیشن، حاجیژن ساواری لێ نابوو چووبوو بۆ کانی ژنان بۆ ئاو. عەزەش بە پەلە بوو ئەیەویست بڕوا. حاجی کوڕێکی لە ماڵ بوو وتی: ڕۆڵە هەستە لۆی تێکە و لۆی چەورکە.

عەزەم عەزە بوو هەر هەستا لووس و باریك ڕۆیشت. حاجی سەلیم وتی: بۆکوێ؟ عەزەش وتی: نە ئەم نانە ئەخۆم و نە بیشمگێن! لۆی چەورکە مەعنای چییە؟

١٨٢. کابرایەکی دەوری شاخەپیسکە ژنێکی خۆشناوی هێنابوو. ژنەکە ئەوەڵ شەو-بلامانێ-یەکێکی پیا هێنا. زۆر تەریق بووەوە. مێردەکەی دڵی دایەوە وتی: قەیدی نییە شتی وا نیشانەی ئەوەیە کە ساڵەکەی خۆش ئەبێت. ژنە تۆزێ کرایەوە و شەرمی شکا وتی: پیاوەکە! کەواتە با یەکێکی تریش بکەنم. پیاوە وتی: ئافرەت نا مەکە، عەمارەکە جێی هیچی تری تێدا نابێتەوە!.

◈◇◈

# بە بنەچە و باوك و دایك نییە:

١٨٣. پیاوێـك هەبـوو لە شـار، دوو کوڕی هەبوو. پیاوەکە خۆی زۆر بەدین بـوو، کوڕەکانـی گەورەکەیان کە ئەتـوت دەنکی هەنارە لـە پیاوەکـە خـۆی بەدینتـر بـوو. هەموو دەم هـەر لە مزگەوتا بوو، سـەری بڕۆیشتایە نوێژی نەئەڕۆیشت. بچووکەکەشیان دائیما لە کۆڕی قومار و لە گۆشەی دووکانی عەرەقفرۆشەکانا بوو. کوڕە زیاد لەمە، حیزیـش بوو.

هـەر لـە شـار پیاوێکیتر هەبـوو، هەرچی خوا حەزی لێـی نەکردایە ئـەو ئـەوەی ئەکـرد؛ کەچی کوڕێکـی هەبوو بەپێچەوانـەی ئەو، نوێژت لەسەر داوێـنی بکردایە. بەڕاستی کوڕە، وەلییەك بوو بۆ خۆی!.

١٨٤. کابرایەکی سییان ژنێکی هێنابوو، شـەوێ کە ئەچێتە لای ژن تەماشا ئەکا ژنە بەری خۆی پاك نەکردۆتەوە. پێی ئەڵێ: ئافرەت ئەوا من مێرد و مەحرەمتم قەیناکا، بەڵام ئەگەر بەم حاڵە چوویتە لای یەکێکی نامەحرەم و بێگانە هیچ خەجاڵەتی ناکێشی و ناڵێیت عەیبە؟!.

١٨٥. ڕەحمەتییەکـە ئەیفەرموو: ڕووڕەش: ئەو کەسـەیە کە تووشـی یارەکـەی ببـێ و جێگا چۆڵ بێ، کێری هەڵنەسـتێ. هەروەها ئەیفەرموو خێرخوا: ئەو کەسەیە کە پیرێژنێك بە گانێك بلاوێنێتەوە.

١٨٦. شێخ هادی پشدەری ناردی بۆ ڕشتە وتی: کوڕێك لە «دووز» چـوو بـۆ زوبەیـر. ئـەم کـوڕە ئاشـێکیان هەبوو لـە دووز دایکی

وەڵامی بۆ نارد کوڕم وەرەوە. ئاو هاتووە، سەرکاری ئاشەکە بکە با بکەوێتەوە گەڕ نانێکی لێ بخۆین. کوڕەش وەڵامی بۆ ناردەوە وتی: دایە سمتێك لە زوبەیر بۆ نان‌خواردن، هەزار ئاشی دووز دێنێت!.

١٨٧. عەزیزبەگ، هەرچەندە چاوی نەمابوو، بەڵام ئەوەی خوارەوەی هەر لە کارا بوو. ڕۆژێك لەو دەشتی لای کانی‌ماسییە ماکەرێکی ئەگا، ماکەر ئەتڕی و ئەو شوکری ئەکرد. نەشی‌ئەزانی کە خەڵك دیارە؛ چونکە چاوی نەمابوو.

خەڵکەکە چوون بەسەریا و وتیان: ها عەزیزبەگ خێرە وا شوکری ئەکەی؟ ئەویش زانی ئیشەکەی لێ دەرکەوتووە هیچی بۆ نەمایەوە وتی: چۆن شوکر نەکەم؟ بە عومرێکی هەشتا ساڵییەوە کەر ئەتڕێنم. کێری وا شوکری ناوێ؟!

١٨٨. مەلا سمایلی کانیسکان لەو سەرە ئەبێ بە میوانی ماڵێك. پیاویان لە ماڵەوە نابێ، هەر ژنەکە ئەبێ. ژنە مناڵێکی ئەبێ زۆر ئەگری، هەرچەندە لەگەڵی خەریك ئەبێ ژیری کاتەوە بۆی ژیر نابێتەوە. مەلا سمایل تووڕە ئەبێ و مناڵەکە وەرئەگرێ. ئەویش لەگەڵی خەریك ئەبێ هەر ژیر نابێتەوە. دەستێك ئەدا بەسەر پشتیا و ئەڵێ: ژیر ئەبیتەوە ژیر ببەوە، ژیر نابیتەوە دەسا وەڵڵا دایکت ئەگێم. ژنەش ئەڵێ: دەسا وەڵڵا مامۆستا ئەم مناڵە لاسارە خۆم ئەیناسم، ژیر نابێتەوە تا ئەوەی ئەیڵێیت بە چاوی خۆی نەیبینێ!.

١٨٩. هەر مەلا سمایل گێڕایەوە وتی: لەو وڵاتی بۆڵی و بابۆڵییە ڕێم کەوتە هۆبەیەك. بە شتێکیان ئەزانیم. کچێکیان هەبوو مارەیان

ئەکرد. ڕووم کردە کچەکە وتم: کچم بەلای مەزهەبی ئێمەوە ـکە شافیعین ـ باوك بۆی هەیە کچی خۆی مارە بکا لە هەرکەس کە ئەیکا. ئێستە تۆ کچیت با باوکت مارەت بکا؟ وتی: مامۆستا کچ بووم! خوا عافووم بکا.

١٩٠. پیاوێـك هەبوو لـە سولەیمانی تووشـی داوی ژنێـك بووبـوو. پارەیەکی زۆری تیا خەرج ئەکرد. هەموو کەسیش ئەیزانی وایە. مـن ئەیناسـم، لام وایە تۆیش ئەیناسی. پێیان ئـەوت: بۆچ هەر یەکجار نایهێنی و تووشی ئەو مەساریفە زۆرەش نابیت؟ ئەویـش ئەیوت: بەڵێ ڕاستە، بەڵام لەزەتی ئەوەم لە دەست دەرئەچێ کە هەر جارە بە دزەدزە بۆی بچم و ئەویش وەعدەم بداتێ و درۆم لەگەڵ بکا!.

١٩١. کابرایەکـی فەقیرۆکـە هەبووە لـە «زێویـە» ئەچێتە لای مەلا سمایلی کانیسکان؛ کە مەلای ئەوێ ئەبێ. ئەڵێ: مامۆستا شەرع شـەرمی بـۆ نییـە مـن لەگەڵ خێزانەکەما هەروەخت کـە ئەچمە لای لە وەختی ئیشی شەرعیدا هەر ئەڵێ: دە لاچۆ کوشتمت بچۆ بەولاوە. منیش سـەرم لـێ تێـك ئەچـێ و نازانـم چی ئەکەم. ئەترسـم لەبەر ئەوە تووشی قەتڵێك ببم. ئێستە چارم چییە؟ مەلا سمایلیش ئەڵێ: باوکم بچۆ بەو دەردەوە بیکوژە خوێنی لەسەر من!. کابرا ئەڵێ: خوا دەوامی عومرت بدا.

١٩٢. ئەحمەدئاغـا جارێك لە ئەستەمۆڵ ئەچێتـە ماڵی ئافرەتێکی ڕووسـپی بۆ ئیشـی خێر، ئافرەتەکە ئافرەتێکی لەخواترس بوو! ـبە ڕێکەوت ئەو شەوەش شەوی جومعە بوو ـوتی: من بە شەوی جومعان ئیشی وا ناکەم، چونکە گوناحەکەی دوو بەرانبەرە. ئەحمەدئاغاش وتی: قەیدی چییە وا ئەزانین شەوی شەممەیە و دووجارمان کردووە!.

١٩٣. محەمەدی مەلا کەریم بۆی گێڕامەوە وتی: کابرایەکی ڕوغزایی ئەحمەدی شاسواری ناوبوو، ژنێکی «ئەحمەدبڕنە»یی هێنابوو. کابرا ژنێکی تریشی هەبوو. کە ژنی تازە ئەگاتە ماڵی مێردەکەی، هەوێکەی بەم جۆرە بەخێرهاتنی ئەکا:

**بەخێـر هاتی، بە خـۆش هاتی　　بەسەر پێنج و دوو شەش هاتی**
**بە شـەرمەوە و ڕووڕەش هاتی　　لـەلای خۆتـان کێر بـوو قاتی**
**من لێرە بووم تۆ بۆ هاتی؟**

ئەویش وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێ: بێ‌فەڕ خازە، دەنگت وازە

**پۆپت چەرموگ وەك کلکە سەگ　　حەپەت خراوتر لە دێڵەسـەگ**
**مـن کـە هاتـم بـۆ تـۆ هاتـم　　بـا بیزانـی مـن کێـم؟ فاتـم**
**ئەتڕەتێنـم تـا ئـەو خـوارە　　ئـاوات ئەکـەم لـە ئاوبـارە**
**جوانـی من بـوو دەنگـی داوە　　گشـت ڕوغزایـی هاتنـەو ناوە**
**بەرزیـان کـردۆ شـانی خۆیان　　منیـان کـردە تاجی سـەریان**
**کـە هاتـم من لـە وڵاتـی خۆم　　بـۆ دیقی تـۆ وا کەوتمـە خۆم**

١٩٤. حەمەسەعید بەگی جاف گێڕایەوە وتی: لەو دەشتی «کەلار»ە پیاوێـك هەبوو حەمەعەلی ناو، برایەکیشی هەبوو حەمەی ناو بوو. حەمە تۆزێ شێتۆکە بوو. گوێدرێژێکیان هەبوو، حەمەعەلی بە حەمە ئەڵێ: حەمە نەکەی تەماع بکەیتە گوێدرێژەکە. حەمەش ئەڵێ: کاکە، من چۆن شتی وا ئەکەم. من ئەو کەرە بە دایکی خۆم ئەزانم، پیاو چۆن مرخی ئەپەڕێتە سەر دایکی خۆی!.

١٩٥. شێخ محەمەدی بالیسانی وتی: مەلا مەجیدی شەقڵاوا گێڕایەوە وتی: مەلا مەحموودی مەزناوا لە وەختی خۆیا لەگەڵ چەند کەسێکا بە کاروان ئەچن بۆ شوێنێك، ڕێگاکە نازانن. دەروێشێك هەبوو لەگەڵ خۆیانی ئەبەن بۆ شارەزایی. دەروێش هیچی نەخواردووە و ناخوا؛ وای لێ دێ لە برسانا پەکی ئەکەوێ. هەرچەندە لەگەڵی خەریك ئەبن هیچ ناخوا. ئەڵێن: بۆچ ناخۆی؟ ئەڵێ: شێخ فەرموویەتی: لە کسمی دەستی خۆت نەبێ نابێ شت بخۆی. ئەوانیش سەیر ئەکەن وا کابرا بەلادا دێ و ئەمانیش لەو ڕێگا چۆڵەدا پەکیان ئەکەوێ.

مەلا مەحموود ئەڵێ: باوکم وەرە مادام وایە بە کرێت ئەگرین بە دوو نان بچۆ ئەو کەرە بگێ. کابرا ڕازی ئەبێ، بەڵام لەبەر برسێتی ناتوانێ بچێ بەلای کەرەکەوە. هەڵی ئەگرن و ئەیبەن بەلای کەرەکەوە، وانێکەکەی ئەخەنە دوابڕاوی کەرەکەوە. ئەویش هیچ هۆشی لە خۆی نییە. لە پاش بەینێك کە گەرمای ئەگاتێ و تۆزێ هەستی پیا دێتەوە ئەڵێ: وازبێنن خێرتان بنووسێ، ئیتر خۆم خەریك ئەبم!.

١٩٦. ڕەحمەتییەکە ئەیفەرموو: دوو شت زۆر خۆشە: مووچەی ئەوەڵجار. گانی ئەوەڵ شەو!.

١٩٧. شێخ محەمەدی شێخ عومەر (شێخ محەمەدی خەتیب) گێڕایەوە وتی: مەلایەك شەوێ مێوانی ماڵە پۆلیسێك بوو. پۆلیسەکە سەرێوارە خەفەر ئەبێ و لە ماڵ نابێ. ژنەکەشی جوان و ڕووەو بازاڕی ئەبێ. مەلا تەماع ئەکاتە ژنەکە و خۆی بۆ شەوێ حازر ئەکا و جێگاکەی دیاری ئەکا. شەوێ پۆلیسەکە دێتەوە و ئاگاشی لە هیچ نییە، بەڵام پێی جوان نابێ ژنەکەی بکەوێتە نێوانی ئەو و مەلاوە. بە

ژنەکەی ئەڵێ: جێگاکەی بگوێزێتەوە و خۆی لە شوێنەکەی ئەو ڕائەکشێ. مەلاش ئاگای لێ نییە.

لە نیوەشەوا مەلا ئەچێتە سەر جێگا، سەیر ئەکا ئەمە لە باتی ژنە، پیاوێکە و هیچ دەرەتانیش نەماوە. پیاوە ئەیگرێ و ئەڵێ: ئەوە چی ئەکەی و بۆچی هاتووی؟

مەلا ئەڵێ:

مەیکە بە هەرا من خرووم هەیە، هاتووم بمگێیت. کابرا ئەڵێ: باوکم بچۆ بەولاوە، من تا ئێستە ئەم جۆرە ئیشانەم نەکردووە؛ ناتوانم. مەلا بەم جۆرە خۆی دەرباز ئەکا.



# کلێشەی ڕژدی

**١٩٨.** کابرایەکی چەرداوەڕوو هەبوو هیزەیە ڕۆنی هەڵواسیبوو، هەموو جار کە نانی ئەخوارد پاروەکەی هەڵئەگرت ئەیسوو بە هیزەکەدا و ئەیوت: ئەم نانە بەو ڕۆنە.

کابرا مرد و کوڕێکی لەشوێن بەجێ ما. کوڕەکە لە پاش ماوەیەك لە دایکی پرسی: ئەو هیزە ڕۆنە چییە هەڵواسراوە؟ دایکی ئەڵێ: ڕۆڵە ئەوە ڕۆنە. ڕەحمەتییەکەی باوکت هەموو جار پارووی هەڵئەگرت و ئەیسوو بە هیزەکەدا ئەیوت: ئەم نانە بەو ڕۆنە. کوڕەکەش وتی: جا دایە نەئەترسا هیزەکە کونی تێ ببێ. من نانەکە هەڵئەگرم و هەر لە دوورەوە ئەڵێم: ئەم نانە بەو ڕۆنە. دایکی وتی:

ئۆخەی ڕۆڵە! باوکت شوکر وەجاخی ڕوونە. ئەگەر قنگلاشك بەدەم باوە بێ وەجاخی باوك کوێرەوە نابێ!.

**١٩٩.** کابرایەك هەبوو لە سولەیمانی پێیان ئەوت: «ئەحەچەقەڵ». ڕۆژێك هات بەسەریا؛ ئەڵێ: درەم گۆشتی کڕی لە «ئەمین چیتر». گۆشتی نایە سەر ئاگر و نەینا، پێیان وت: لە گەڕەکی هۆڵی مەولوودییە. هەر خێرا گۆشتەکەی لە مەنجەڵەکە دەرکرد و بردیەوە بۆ ئەمین چیتر. تۆزێکیش کەمی کردبوو. پارەکەی هەر لێ سەندەوە. جا ئەمین چیتر گۆشتەکەی بە دەستەوە گرتبوو بانگی ئەکرد: «خەڵکینە! وەرن ئەمە گۆشتی ئەحەچەقەڵە بیکڕن!».

٢٠٠. کابرایەك هەبوو لە سنە «سواولەسەن»ـی ناو بوو. تۆزێ ڕۆنی کردبووە کەڵە شاخێکەوە هەروەخت کە ئەچووە دەرەوە نیوەی چەوریەسانێك لە ڕۆنەکەی ئەهێنا بە دەست و پەل و دەم و سمێڵیا لەناو خەڵکا خۆی پێوە هەڵئەکێشا ئەیوت: بەخوا ئیمڕۆ چێشتەکەمان زۆر چەور بوو.

ڕۆژێك کوتوپڕ پشیلەیەك کەڵەشاخەکە ئەفڕێنێ. کچێکی هەبوو هەڕای کرد بۆلای باوکی ـکە لە مزگەوت لەناو خەڵکەکەدا دانیشتبووـ هاواری کرد: بابە هینەکە کتك بردی. وتی: ڕۆڵە هینەکە چەس؟ هیچ بیری لای کەڵەشاخەکەدا نەڕۆیشت؛ چونکە وا بە قایمی هەڵی گرتبوو شەیتانیش نەیئەدۆزییەوە. وتی: بابە ئەوەی سمێڵەکانت پێ چەور ئەکردا!.

٢٠١. وتی: ئەوا سەیر ئەکەم دوو کابرا شەڕیانە و بەربوونەتە سەروگوێلاکی یەك. وتم: ئەوە چیتانە؟ بۆچ بەیەکا هەڵژناون؟ یەکێکیان وتی:

کوڕە! من میوانم هاتبوو چووم مریشکێکم بۆ سەربڕی. قاچەکانم هێنا هەڵمواسی بەسەر دەرگاکەی خۆمانا بۆ ئەوە خەڵك بزانن کە من مریشکم کوشتۆتەوە. کەچی ئەم کابرایە هاتووە قاچە مریشکەکەی لەسەر دەرگاکەی من لابردووە و بەسەر قاپی حەوشەکەی خۆیەوە هەڵیواسیوە بۆ ئەوە شانازی پێوە بکا و خەڵك وا بزانن کە ئەو مریشکی کوشتۆتەوە!.

٢٠٢. کابرایەك لەو دەوروبەری دزەییە ژنێکی هەبوو «گوستە»ی ناو بوو؛ تۆزێ پیویان هەڵواسیبوو. هەروەخت کە گوستە شیوێکی لێ بنایە پیوەکەی ئەهێنا لەباتی تامەچێشت، جارێك ئەیکرد بە مەنجەڵە شیوەکەدا و خێرا دەری ئەهێنایەوە.

ڕۆژێـك میوانیان هاتبوو، گوستە ساواری لێنابوو هێنـای داینا. پیاوە وتی: ژنەکە شیوەکە هیچ چەور نییە. ژنە ساوارەکەی کردەوە مەنجەڵەکە و چوو جارێکیکە پیوەکەی تێهەڵسووڕان و وتی:

تۆ بەزەیـت بە خۆتا نایەتەوە، ئەو برامە لۆ چ نەخۆش بکەوێ؟ دەبا سکتان بچێ، پاشان نەرێی: گوستە سووچی تۆ بوو.

٢٠٣. خواجەیاقۆ هەبوو لە سولەیمانی دووکانی هەبوو لە بازاڕا. هەموو جار نیـوەڕوان کـە کولێرەی ئەکڕی، ئەچـوو ناوە نەبرژاوەکەی دەرئەهێنا ئەیکرد بە پێخۆری ئەویتری. لێیان ئەپرسی: خواجەیاقۆ ئەوە چی ئەخۆی؟ ئەیوت: نان و ناوەکەی!.

٢٠٤. «کـەلای مـراد» ڕەقیتـەی کردبوو، کوڕەکانـی هەرچەندە داو و دەرمان و حەکیمیان بۆ هێنابوو هیچ کەڵکی نەبوو. چوونە لای شێخ مراد نووشتەی بۆ بکا. شێخ مراد ئەیناسی و چاکی ئەناسی وتی: پێم بووشن چاوی سۆما کەت؟ وتیان: ئا.

وتی: نوشتە نەتوات، بچن نانێك لە ماڵی خۆی بارن وە بەرچاویـەوە بخونەی، ئەرەق کاتەوە و ڕزگار ئەوت!.

٢٠٥. کابرایەکـی دەرۆزەکەر کچێکی هەبـوو هەرکەس داوای ئەکرد نەیئەدایە و ئەیوت: ئەیدەم بە یەکێك بتوانێ نان پەیدا بکا و لە خۆم ئازاتر بێ. ئەو کابراشە بێجگە لەوە کە سەرکەردەی سواڵکەرەکان و زۆر دەوڵەمەندیش بوو، چۆلەکە ڕێزەوڵی لە ماڵیا نەئەبینی. بەم جۆرە ئەم کچەی هەر مایەوە و کەسی وا نەبوو بیداتێ.

ڕۆژێـك کابرایەکی سـواڵکەر هـات داوای لێ کرد. ئەویـش هەر وای جواب دایەوە. ئەمیش وتی: چلۆن، لە خۆت سواڵکەرتر بێ؟ وتی: ئەگەر

توانی شتێکی لە من سەند ئەوە لە خۆم ئازاترە. کابرا هات خۆی لێی گۆڕی و چەند ساڵێك شوێنی کەوت نەیتوانی هیچی لێ ببەستێتەوە.

ڕۆژێك باوکی کچە چوو بۆ حەمام ئەمیش بەشوێنیا چوو. لە ژووری حەمامەکە بەرۆکی گرت وتی: ئاغە بۆ خاتری خوا شتێکم بدەرێ. ئەویش وتی: بڕۆ سەگباب! لێرە چیت بدەمێ؟ چی هەیە تا لێمی بستێنی. ئەم هەر لێی نەبووەوە. ئاخری کابرا بەری ئەتاشی، پێی وت: ئەگەر تەڵێ لە مووی بەری خۆیشتم بدەیتێ من هەر پێ ڕازیم، بۆ ئەوە بە ناهومێدی نەگەڕێمەوە دواوە. کابرا دەستی برد وتی:

ها سەگباب! ئەوە تەڵێ مووی بەرم. دە بچۆ بیکە بە پەلکەی دایکت. بزانم مووی بەرت بۆ چییە؟ کابرا مووەکەی وەرگرت و ئینجا خۆی لێ ئاشکرا کرد و وتی: گرەومان بردەوە یان نە؟ کابرا وتی: ئەشەدوبیللا لە من ئازاتر و پیاوتری. کە هاتنە دەرەوە ئیتر کچەکەی لێ مارەکرد.

٢٠٦. ڕۆژێك دوو سێ فەقێ ئەچنە «بیبانی»، ماڵی کۆنەکوێخاکەی بیبانی. ئەم کابرایەش زۆر چرووك ئەبێ و لە ماڵیش نابێ. لە پاشا کە دێتەوە چاوی پێیان ئەکەوێ ئەڵێ: یاڕەبی چ بکەم؟ من خۆم نانم پێ ناخورێ، ئێستە ئەمانەش هاتن بوون بە سەربار. ئەکەوێتە ئەم دەلیای فیکرەوە.

یەکێ لە فەقێکان چاوی پێ ئەکەوێ ئەڵێ: فەرموو خاڵە. کابرا ئیتر خۆی بۆ ناشاردرێتەوە دێت دائەنیشێ. لەگەڵ دانیشتن ئەڵێ:

ئەرێ فەقێینە ئاگرتان پێ نییە؟ یەکێك لە فەقێکان ژیر ئەبێ ئەڵێ: کوڕینە هەڵسن با بڕۆین، ئەم کابرایە دەمودوویەکی باشی نییە و شتیتر ئەقەومێ. بەم جۆرە کابرا لە کۆڵیان ئەکاتەوە.

٢٠٧. سەردەمی درەم بوو، چوار کەسی مووسڵی چوونە بازاڕ، هەشت درەم گۆشتیان کڕی. هێنایان هەریەکە پەتێکیان بەست بە بەشەکەی خۆیانەوە و خستیانە مەنجەڵێکەوە و خستیانە سەر ئاگر. هەرکەسە سەرەپەتی خۆی بەدەستەوە گرتووە. پاش ئەوە کە کوڵا، هەریەکە پەتی خۆی ڕاکێشا و بەشە گۆشتی خۆی هێنا و خواردی. ئەمجا ئاوەکەشیان بە شەریکی خوارد!.

٢٠٨. هەژار وتی:

سـوارێك ڕادەبرد لە کوێـرە دێیەك
پیسـکەیەك گوتـی: ببـە میوانـم
گورجێ دابەزی و پرسی: ئەسپەکەم
لەکـوێ گـرێ دەم، ماڵـت نازانم؟
گوتی: نەمزانی گوێت هێندەسووکە
مـن پەشـیمانم، بیخـەرە زمانـم!

٢٠٩. شێخ بەشیری ئەترووشی گێڕایەوە وتی: «عبدُالباری» هەبوو لە مووسڵ، بازرگانێکی زۆر گەورە بوو. «خواجەدانیال»ـیش هەبوو لە بەغدا. عەبدولباری چەلەبی و خواجەدانیال تجارەتیان لەگەڵ یەك هەبوو، شتومەکی مووسڵ و بەغدایان بۆ یەك ئەنارد. زۆر بە درەنگیش یەکتریان ئەبینی؛ چونکە ئەو سەردەمە هاتوچۆ لە بەینی شارەکانا کەم بوو. ساڵێك عەبدولباری چەلەبی لە هاوینا ڕێی ئەکەوێتە بەغدا لە حوجرەکەی خواجەدانیالا لە خانی سەفافیر دائەنیشن. ئەو سەردەمە باوەشێنە پووشە خورماکان هەبوو. پیاوە گەورەکان ئەیانکڕی و باوەشێنی خۆیانیان پێ ئەکرد. لەو کاتەدا باوەشێن فرۆش بەوێدا تێ ئەپەڕێ، چەلەبی و دانیال

هەریەکە باوەشێنێك ئەکرن.

چەلەبی ئیشی تەواو ئەبێ و ئەگەڕێتەوە بۆ مووسڵ و باوەشێنەکەی خۆی لەگەڵ خۆی ئەبا. لە پاش سێ چوار ساڵ دیسان ئیشی بەغدای ئەبێ و ئەچێتەوە بۆ بەغدا و لەسەر سەکۆی حوجرەکەی خواجە دانیال دائەنیشن. چەلەبی مووسڵی تەماشا ئەکا باوەشێنەکەی دانیال جوو کۆن بووە. لێی ئەپرسێ: بڕوا ئەکەی باوەشێنەکەی ئەو ساڵە پێکەوە کڕیمان، ئەڵێی کۆنت کردووە!؟ دانیالیش ئەڵێ: باوەشێنی ئەو ساڵەی چی؟ لەو وەختەوە تا ئێستە هەموو ساڵێ باوەشێنێکم کڕیوە، ئەمە هی ئیمساڵە وا تۆ بە کۆنی ئەزانێ.

چەلەبی مووسڵی ئەڵێ: بۆچی تۆ چی لێ ئەکەی وا کۆن بووە و کۆن ئەبێ؟ دانیال ئەڵێ: چی لێ ئەکەم؟ ئەیگرم بە دەستەوە باوەشێنی خۆمی پێ ئەکەم. چەلەبی ئەڵێ: ماڵ کاول چۆن وا ئەبێ؟ دەسا هینەکەی من هەر ئەوەی ئەو ساڵەیە و هێشتا هەر تازەشە. دانیال ئەڵێ: بۆچی تۆ چی لێ ئەکەی؟. چەلەبی مووسڵی ئەڵێ: من باوەشێنەکە لەسەر دەسکەکەی قیت دائەنێم و بە دەست ئەیگرم. سەرم بە بەریا هاتوچۆ پێ ئەکەم وەکوو یەکێ «حی اللّٰه» بکا! ئێوەی جوولەکە مردووتان مرێ نازانن چۆن ئەژین و چۆن پارە خەرج ئەکەن!.

٢١٠. کابرایەك هەبوو لە «نەغەدە» کەڵەشێرێکی هەبوو، هەرچەندە ماڵ و مناڵەکەی پێیان ئەوت: با سەری ببڕین، ئەو هەر ئەیوت: ئیمرۆ نا سبەینێ. کەڵەشێر بەم جۆرە چەند ساڵێکی ڕابوارد. وای لێ هات لەبەر پیری ئیتر هێزی تیا نەما، نەیئەتوانی چینە بکا و شتێك بۆ خۆی پەیدا بکا. کابرای خاوەنیشی هیچی نەئەدایە، لە تاوانا وشك هەڵگەڕابوو.

ڕۆژێك کەڵەشێر هاتە مردار بوونەوە، کابرای خاوەنی خێرا فریای کەوت و سەری بڕی. ئەمجا خستیانە ناو مەنجەڵ و خستیانە سەر ئاگر. ماڵ و منداڵ لە خۆشیانا کەوتنە سەما بە دەوری مەنجەڵی گۆشتی کەڵەبابا.

ئەو ڕۆژە هەر لەبەیانییەوە تا ئێواری کوڵا و دایانگرت. سەیر ئەکەن لەبەر پیری وەکوو ئاگری هەر نەدیبێ وابوو. ئاوەکەیان ئەو شەوە بە نانەوە خوارد و ڕۆژی دوایی سەرلەنوێ خستیانەوە سەر ئاگر. لە ئێوارەدا دایئەگرن و سەیر ئەکەن هەروەکوو دوێنێ وایە، نەکوڵاوە. ئەو شەوەش ئاوەکەیان خوارد و گۆشتەکەیان هەڵگرتەوە بۆ بەیانی.

دراوسێکیان هەبوو لە نیوەشەوا میوانیان هات دەستیان بە هیچ لایەکدا نەگەیشت بە کوڕەکەی خۆی وت: ئا ڕۆڵە بچۆرە ماڵی مامت پێی بڵێ: باوکم ئەڵێ: میوانمان هاتووە و دەستمان بە هیچ لایەك ناگا، کەڵەشێرەکەمان بۆ بنێرێ تۆزێ ئەیخەینە سەر ئاگر میوانەکەی پێ ڕازی ئەکەین و سبەینێ بۆیان ئەنێرینەوە!.

٢١١. کابرایە هەبوو زۆر ڕژد و چرووك بوو. زیاتر لە حەفتا ساڵ عومری کردبوو، دەوڵەتێکی زۆری پێکەوە نابوو. هیچکەس دەرگای ماڵی نەدیبوو. تەنانەت مێرووله بە ئاوات بوو تۆزێ وردە نانی لە ماڵیا دەستکەوێ، بەو داخەوە مرد و هیچی دەست نەکەوت.

ڕۆژێك کۆمەڵێ سواڵکەر کۆ بوونەوە سەرگوزەشتی خۆیان ئەگێڕایەوە، هاتنە سەر ئەو کابرایە. هەموویان وتیان: تا ئێستە هیچمان لێ نەدیوە. یەکێکیان ڕاست بووەوە وتی: کێ گرەوم لەگەڵ ئەکا؟ یەکێکیان وتی: من لەسەر دووسەد قڕان گرەوت لەگەڵ ئەکەم، ئەگەر هەر لە ئێستەوە تا ساڵێکیتر تاقە پوولێکت لێ سەند، من دووسەد قڕانت بدەمێ. لەسەر

ئەمە لێك جیابوونەوە.

کابرای سواڵکەر هەستا چووە سەر دووکانی بازرگان وتی: لە ڕێی خودا شتێکم بدەرێ. وتی: خوا بتداتێ و دووکانی هەڵگرت و چووەوە بۆ ماڵەوە و ئەمیش شوێنی کەوت.

ئەو چووە ژوورەوە و قاپی داخست. لە پاش تۆزێك هاتە دەرەوە چوو بۆ مزگەوت. دیسان داوای لێ کردەوە ئەویش هەر وتی: خوا بتداتێ. ئەو شەوە ئەو دەرگایە بەجێ نەهێشت.

بەیانی کابرا کە هات بچێ بۆ دووکان سەری ڕێگای پێ گرتەوە و وتی: لە ڕێی خودا شتێکم بدەرێ، ئەویش هەروەکوو جاران وتی: خوا بتداتێ.

سەرت نەیەشێنم لێی نەبووەوە، حەیشی پێی تاڵ کرد. بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە هەر هیچی نەدایە، وتی: باشە ئێستە هیچم نادەیتێ نامدەیتێ، بەڵام قسەیەکم بدەرێ کە فڵانە وەخت شتێکت ئەدەمێ. چەند ڕۆژێکیش بەمجۆرە ڕایانبوارد. وای لێ هات ماڵ و مناڵی کابرا وەڕس بوون. وتیان: پیاوەکە ئێستە چیت لێ کەم ئەبێتەوە ئەگەر بڵێیت لە پاش ئەوەندە وەخت شتێکت ئەدەمێ و ئەو وەختەش نەیدەیتێ و ئێستەش لە کۆڵ خۆتت کردبێتەوە؟. کابرا هەر ڕازی نەبوو. ئەمیش وەکوو میچ هەر لێی نەبووەوە. بۆ بازاڕ ئەچوو، بۆ مزگەوت ئەچوو، بۆ ماڵ ئەچوو، هەر بەشوێنیەوە بوو. ئاخری کابرای کردە کون، چاری نەما وتی: بڕۆ سەگباب لە پاش ساڵێکی‌تر وەرەوە پوولێکت ئەدەمێ. ئەویش وتی: خوا لێت بەزیاد کا و ڕۆیشت.

لە پاش سەعاتێك چوو بۆ ماڵەکەی و تەقەی دا لە قاپی. وتیان: کێیە؟ وتی: منم سواڵکەرەکەم. عەرزی ئاغا بکەن ئەوە لە ساڵەکە سەعاتێکی ڕۆیشت. ئەمەی وت و لێی دا ڕۆیشت. سەعاتێکی‌تری پێ چوو دیسان چووەوە و تەقەی دایەوە لە قاپی. وتیان: کێیە؟ وتی: منم سواڵکەرەکەم،

عەرزی ئاغا بکەن ئەوا لە ساڵەکە دوو سەعاتی ڕۆیشت و لێی دا ڕۆیشت.

بە کورتی بەم جۆرە دنیای لە کابرا کردە پێستی چۆلەکە. هەر سەعاتێ نە سەعاتێ هەڵی‌ئەکوتایە سەری ئەیوت: عەرزی ئاغا بکەن لە ساڵەکە ئەوەندە سەعاتی بەسەر چوو.

لە پاش چەند ڕۆژ کابرای دەوڵەمەند ئیتر لە توانایا نەما، بانگی کرد: وەرە سەگباب، ئەوە پوولەکەت و وازم لێ بێنە. ئەوی تۆ بە منت کرد تا ئێستە عومرم بەم عومرە گەیشتووە کەس پێ نەکردووم. سواڵکەر پوولی لێ وەرگرت و بەم جۆرە گرەوەکەی بردەوە.

٢١٢. کابرایەك لەو کوێستانە زۆر برسی بوو، ڕووی کردە ماڵێکی زۆر گەورە. کوڕێك هاتە دەرەوە. کابرا لێی پرسی: خاوەنی ئەم ماڵە لە کوێیە؟ کوڕەکە وتی: تا پارووێك نانم نەدەیتێ پێت ناڵێم!. کابرا بێ قسە لێی دا ڕۆیشت.

٢١٣. کابرایەکی خۆشناو جووتێ پێڵاوی تازەی هەبوو، چوو بۆ کاروان بۆ ئەو دەشتی «بیتوێن»ـە، تووشی چڕ و دڕکوداڵێك بوو پێڵاوەکانی داکەند و بە پێی پێخاوس نایە مل دڕك و داڵەکە. کوتوپڕ چقڵێك ئەچەقێ بە ژێر پێی دا لەسەر پێوە دەرئەچێ. لەو کاتەدا کە چقڵەکەیان لە پێ دەرئەهێنا ئەیوت: یاڕەبی شوکر! هەر باش بوو پێڵاوەکانم لە پێدا نەبوو، ئەگینا کونیان تێ ئەبووا!.

٢١٤. کابرایەك هەبوو ـ منیش ئەیناسم، وەڵڵا سا تۆیش ئەیناسی ـ ئەیوت: ئەم ئاوە جوانە هەبێ پیاو نان بە دۆوە بۆچ بخوا.

منیش هەزار ساڵ عومرم بێ، پانکە شڕێك لە مزگەوتەکەما هەبوو لە بەغدا لەگەڵ ئەوەشا کە خەرج و باجی لەسەر من نەبوو هەر نەم‌ئەکردەوە.

دنیاش گەرم بوو ئەیانوت: بۆچ نایکەیتەوە؟. ئەموت: ئەم «با» جوانە هەبێ پیاو بای پانکەی بۆچییە؟ لەگەڵ ئەوەشا با هەر نەبوو. بەسەری تۆ هەزار ساڵیش عومرم نابێ؛ کەواتە بڵێ: بەڕەحمەت بێ.

٢١٥. خاڵە مەحموو جارێك بە ڕەشەی کوڕی ئەڵێ: ڕۆڵە هەندێ نانم بۆ بێنە و دەرگاکە داخە. ئەویش ئەڵێ: بابە حەق ئەوەیە دەرگاکە داخەم، ئەمجا نانەکە بێنم. باوکیشی ئەڵێ: بەڵێ بەڕاستی ڕۆڵە کوڕی منیت و تۆ لە من ئاقڵتریت!.



# داستان

٢١٦. هەژار گێڕایەوە وتی: لەو سەرە پاشایەك هات بەسەریا کە یاسایەك دابنێ لە یاسای پادشاکانی پێش خۆی نەچێ و ئەمیش بە داهێنانی ئەم یاسایە ناوێك بۆ خۆی دەر کا. فەرمانی دەرکرد: کە ئەبێ لە قەڵەمڕەوی ئەودا شەو ببێ بە ڕۆژ و ڕۆژ ببێ بە شەو؛ واتە ئەو ئیشانەی کە بە ڕۆژ ئەکرێن ئەبێ بە شەو بکرێن، بە ڕۆژێش خەڵك بۆ خۆی بنوێ.

ڕۆژێك ـ کە شەوی ئەوە ـ هەستا چووە بازاڕ بزانێ مەردم فەرمانەکەیان لە گوێ گرتووە؟ کە چوو سەیری کرد وا پینەچییەك مۆمێکی داگیرساندوە و لە بەری دانیشتووە پینەچێتی ئەکا. وتی: کابرا ئەوە تۆ ئەو مۆمەت بۆ داگیرساندووە؟ کابرا وتی: قوربان ئەگەر شەو کاری بەدەمەوە نەکەم بە ئیشەکەی ڕۆژم پێوە بەڕێوە ناچم.

٢١٧. «هۆلاکۆ» پەلاماری بەغدای دا. «مُستَعصَم» ئاخر خەلیفەی عەباسی بوو، هۆلاکۆ ویستی بیکوژێ، پیاوانی ئایینی وایان بڵاو کردبووەوە کە ئەگەر خەلیفەکانی عەباسی نەمێنن، دنیا ئاخر ئەبێ. ئەم قسەیە بە جۆری بڵاو بووبووەوە تەنانەت بەرگوێی هۆلاکۆیش کەوتبوو، وە بوو بە ترسێك لە دڵیا.

لە پاش گەلێ سێ و دوو کردن لەم بابەتەوە ئاخر قسەی هاتە سەر ئەوە وتی: «موستەعسەم» بگرن و بیخەنە ناو لبادێك و بیسوونەوە. ئەگەر تەم و مژ و نیشانەی دنیا ئاخر بوون پەیدا بوو، ئەوا بەڕەڵای کەن و منیش واز

لەم فیکرەیە دێنم؛ ئەگەر خۆ هیچیش ڕووی نەدا ئیتر بە جارێ بیکوژن.

لە ڕاستیدا هێنایان وەکوو ئەو وتی وایان لێ کرد، سەیریان کرد هیچ نیشانەیەکی دنیا ئاخربوون پەیدا نەبوو. ئینجا هێنایان لە ١٢٤٢ی میلادی کوشتیان و بنەماڵەی عەباسی بە دەست هۆلاکۆوە بە تەواوی دوایی هات.

**٢١٨. ئەزانی «شاییەکەی بناویلە» چییە؟**

«بناویلە» دێیەکی بچووکە لە بناری سولەیمانی. لە سەردەمی خۆیدا هەر حەوت ماڵ بووە. «شایی»یەکیان کردووە و بووکێکیان لەناو خۆیانا گوێزاوەتەوە. دەنگی ئەم شاییە گەیشتۆتە سولەیمانی و کۆیە و هەڵەبجە و قەڵاچوالان. هەر دەهۆڵ و زوڕناژەنێك لەو وڵاتانەدا هەبووە، هەموویان کشاون بۆ بناویلە. تەنانەت لە وڵاتی سنەیشەوە هەر بۆی هاتوون. کە شایی گەرم بوو و کۆڕی هەڵپەرکێ بەستراوە، سەیریان کردووە دەهۆڵ و زوڕناژەنەکان لە دەستەی هەڵپەرکێکەر گەلێ زۆرتر بوون. ئەمە بە مەرجێ کە مەحموودی سەلیم ئاغا و مستەفاغای برای کە مودیری سرۆچك بوو و ئەحمەدبەگی سیاگوێزیش هەر چووبوون بۆ ئەو شاییە. ئەگەر کۆڕی هەڵپەرکێ حەو کەس بووبێت. دەستەی زوڕناژەن بیست کەس بوون.

| | |
|---|---|
| ئەمەبوو شـایی بناویلە | خەجە و مەجە و فاتیلە |
| خلـە و بلـە و قەویلـە | کۆپانـە شـڕەی تەویلە |
| گەرمیان کردبوو بە چۆپی | قریوە ئەگەیشـتە پۆپی |
| زوڕنا و دەهۆڵ بە تۆپی | پـێ ئەکەنێ بـە پۆپی |
| پیرێژنـی سـەد سـاڵە | هیـچ نەیئەمـا چ ناڵـە |
| ئەیوت: هەروا ئەم حاڵە | بابمێنـێ لـەم ماڵـە |

٢١٩. فەقێ محەمـەدی هەمەوەند هەبوو لە وڵاتی سولەیمانی، لە سەردەمی ئینگلیزەکانا مودیری ناحیەی بازیان بوو؛ وەکوو ئەمین بەگی قامیشیش قائیمقامی چوارتا بوو.

ئەم فەقێ محەمەدە کوڕێکی هەبوو مەحموودی ناو بوو. کە مەکتەب داهات، مەحموود تا پۆلی شەشی سەرەتایی خوێندبوو. ئەمە بۆ ئەو سەردەمە زۆر بوو. مەحموودیش خۆی لە خۆیا کوڕێکی بە جەربەزەو زیرەك و زماندار بوو. هەر لە پاش ١٩٣٠ سەربزێوی ئەکرد و لەوانە بوو کە گەلێ جار بەهۆی زمان و جەربەزەییەکەیەوە ناوی کەوتبووە بەر دەمی کاربەدەستانی میری.

مەجید یەعقووبی موتەسەڕیفی سولەیمانی ئەبێ، ئەنێرێ بەشوێن فەقێ محەمەدا پێی ئەڵێ: نەختێ ئامۆژگاری ئەم کوڕەت بکە با ئەوەندە سەربزێوی نەکا. فەقێ محەمەدیش ئەڵێ: جەنابی موتەسەڕف پێنج شەش هەزار ڕووپیەم لە مەحموودا خەرج کردووە لە مەکتەبدا تا بووە بەم مەحموودە. ئێستە پێنج شەش هەزار ڕووپیەی‌ترتان ئەدەمێ مەحموودەکەی جارانم پێ بدەنەوە.

٢٢٠. کابرایەك هەبوو لەو بەرکێوە، مام ئەوڵای ناو بوو. هەرچەند لێیان ئەپرسی: مام ئەوڵا عومرت چەندە؟ ئەیوت: پەنجاوپێنج ساڵە. وا ڕێ کەوتووە لە پاش دە پانزە ساڵی‌تر لێیان پرسیوەتەوە: مام ئەوڵا عومرت چەندە؟ هەر وتوویە پەنجاوپێنج ساڵ. ئەیانوت: ئاخر چۆن ئەبێ پێش دە پانزە ساڵ پەنجاوپێنج و ئێستەش هەر پەنجاوپێنج؟ ئەویش ئەیوت: برام پیاو ئەبێ لەسەر قسەی خۆێ بێ؛ نابێ هەر ڕۆژێ قسەیەك بکا!.

٢٢١. کابرایەك لە «دۆڵ پەموو» فێر بووبوو بە حوجرەی فەقێکان، هەموو ڕۆژێ لە کاتی نان خواردندا ئەچوو دائەنیشت و ئەبوو بە شەریکیان و ئەیوت: «ئای نەسیب!». بەم جۆرە فەقێکانی بۆژە کردبوو.

ڕۆژێك لەسەر شێوەی جاران چووەوە. فەقێیەك لە فەقێکان زۆر داخ لە دڵ بوو لێی. کابرا هەرکە دانیشت فەقێکە هەستا و هاتە وێزەی، شلوکوتی کرد و وتی: «ئای ئەجەل!». ئیتر کابرا بیرای بیرای نەچووەوە بەوێدا.

٢٢٢. مەلا حەمەمینی شانەزەری شاتری هەبوو، عێل سەرەوژوور ئەبێتەوە بۆ کوێستان، ئەم لە شارەزوور ئەچێ بۆ ئاش. گابارەکەی ئەمرێت و پەکی ئەکەوێ. ماڵەگەورە «مەحمووپاشای جاف» لە دواوانی زەڵم و تانجەڕۆ خستوویەتی. هەڵئەستێ ئەچێ بۆلای مەحمووپاشا و ئەڵێ: تۆ کێیت؟ پاشاش ئەڵێ: تۆ کێیت؟ ئەڵێ:

من حەمەمین شانەزەرم  سەگی قاپی شاعومەرم
عێل سەرەوژوور بۆ کوێسان  من ماگمەسەو دەسەوسان
گیرم خواردگە لە ئاشا  هاوارم برد بۆ پاشا
چارم بکا لەم دەردە  گابارێکم بۆ بەردە
باری لێ نێم ڕووەو عێڵ  با پێم نەیژن تووتکی خێڵ

پاشاش دوو گاباری ئەداتێ و ئەڕوا.

٢٢٣. لە وڵاتی ئەردەڵان منداڵان بە تەنیشت یەکەوە دائەنیشن و قاچ ڕائەکێشن و بەم جۆرە هەلوور بلوور ئەکەن، ئەڵێن:

هەتۆڵ مەتۆڵ، سەگی گەڕۆڵ/ ئاردەکێ، ئاردانەکێ/ مێخم کوتا مێخ هەڵبەزی/ تیکەی چەپم لێ نەبەزی/ بەن سوور بام دا/ عایلەمەنەی خوام دا/ کاسەی ماس پڕ لە پووش/ خوا دای هەڵیلووش.

(هەڵیلووش، بەر هەر قاچێك کەوت ئەوەیان ئەو قاچەی هەڵئەکێشێت و دیسان لە قاچی تەنیشت ئەوەوە دەست ئەکەنەوە بە یاری تا هەموو قاچەکان هەڵئەکێشرێنەوە).

٢٢٤. کەری ئاقڵ! لەو سەنگاوە لە دێی «درۆزنە» پیاوێك هەبوو ناوی ئەورەحمان بوو. ئەم ئەورەحمانە جووت و گا و فەلایی ئەکرد. ساڵێکیان گەنمی کردبووە چاڵ و بۆ ساڵی دوایی چاڵەکەی لێ ون بووبوو. هەرچەندە بۆی گەڕا، نەیدۆزییەوە. گوێدرێژێکی هەبوو کە ساڵی پار گەنمەکەی لەسەر خەرمان پێ بردبوو بۆ سەر چاڵەکە و هێنای لەسەر جێگا خەرمانەکەی پار بارێ گەنمی نا لە گوێدرێژەکە و بەرەڵای کرد و خۆی شوێنی کەوت. کەر ڕۆیشت ڕۆیشت، تا گەیشتە سەر چاڵەکە و لەوێدا وەستا. کە دایانەوە سەیریان کرد ئەمە چاڵە گەنمەکەیە. بەو جۆرە ئەورەحمان چاڵەکەی دیەوە!.

٢٢٥. شێخ سەعیدی حاجی شێخ عەلی گێڕایەوە بۆ ڕشتە وتی: لەو سەرە عالمێکی گەورە ـکە ناوبانگی پیاوچاکیشی دەرکردبوو- ڕێی ئەکەوێتە ئەشکەوتێك. تەماشا ئەکا سێ چوار پارچە ئاڵتوون لە شکڵی چوار گۆشەدا دانراوە. ئەویش لە دڵی خۆیا ئەڵێ وا چاکە هەڵیان بگرم؛ بۆچی بە خۆڕایی لێرەدا بکەون، ئەیاندەم بە هەژارێکی داماو ئەو کەڵکیان لێ وەرئەگرێ. هەڵیان ئەگرێت و دێتەوە دەرەوە.

لە ڕێگادا تووشی کابرایەکی پیری کۆماوە ئەبێ خەریکی کۆکردنەوەی چیلکە و چەواڵە. لێی ئەپرسێ: ئەرێ مامە خەریکی چیت؟ ئەڵێ: قوربانی سەرت بم! ئەم چیلکە و چەواڵانە کۆ ئەکەمەوە ئەیبەم بۆ شار ئەیدەم بە سێ چوار کولێرە بۆ منداڵەکانم.

عالمەکە لە دڵی خۆیا ئەڵێ: بەخوا لەمە هەژارترم دەست ناکەوێ کە ئاڵتوونەکانی بدەمێ. لێی ئەپرسێ: مامە ناوت چییە؟. وتی: بەقوربانت بم! سۆفی پیرۆت. ئەمجا دەستی کرد بە گیرفانیا ئاڵتوونەکانی دەرهێنا و وتی: سۆفی پیرۆت بچۆ ئەم ئاڵتوونانە بفرۆشە بیدە بە شتومەك بۆ منداڵەکانت.

سۆفی پیرۆت کە تەماشای ئاڵتوونەکانی کرد وتی: ئای بەقوربانت بم! ئەمە هی ئەشکەوتەکە نەبێ؟ وتی: بەڵێ. وتی: بە ساقەی سەرت بم! ئەگەر لە هەلگرتنی بوومایە دە ساڵ بوو هەڵم گرتبوو. خۆم تووشی ئەو گوناحە ناکەم. چیلکە و چەواڵەکەی خۆم بەبێ منەت ئەیفرۆشم و ئەیدەم بە نان بۆ مناڵەکانم!.

٢٢٦. لەو دەشتی دزەیی و گەردییە لە گوندی «گێژی» ڕۆژێك دەنگ بڵاو بووەوە کە لە گوندی «گڕاوێ» بزنێك دەستی خستۆتە بناگوێ و حەیرانان ئەڵێ!.

ئەم دەنگە گوندەکەی شڵەژان. سەید عەزیز هەبوو وتی: ئا وڵاغم بۆ بێنن بچم بۆ گڕاوێ بزانم وایە؟ وتی: سوار بووم لە کاتی عەسرا گەیشتمە ئەوێ. پێش هەموو شتێ پەلەی نوێژەکەم بوو، چووم بۆ مزگەفتێ ئەوەندەم زانی خەرکی پێشیان لێ گرتم وتیان: ئەرێ سەید حەزیز ڕاستە دەرێن لە گێژی بزنێك دەستی خستۆتە بناگوێ و حەیرانان دەرێ؟! وتی: کە ئەمەم زانی خێرا نوێژەکەم کرد و گەڕامەوە لۆ گێژی.

٢٢٧. دەستەیەکی جەردە تووشی کاروانێك ئەبن. کاروانەکە ڕووت ئەکەنەوە. لە کاروانەکەدا ئافرەتێك ئەبێت، ئافرەت جلوبەرگێکی جوانی لەبەرا ئەبێت. یەکێ لە جەردەکان مرخی خۆی لە جلوبەرگی ئافرەتەکە خۆش ئەکا. ئەڵێ: ئەمانە بۆ ژنەکەی من باشن. ئافرەت

ئەکێشێتە لاوە ئەڵێ: ڕووتەوە بە. ئافرەت ئەڵێ: پیاوی چاك بە من ژنم تۆ چۆن وێژدانت هەڵیئەگرێ من ڕووتەوە کەی؟ کابرا ئەڵێ: من ئەمانە نازانم، ڕووتەوە بە. ئافرەت زۆر ئەڵێ و ئەم کەم ئەچێ بە گوێچکەیا.

ئافرەت ڕووت ئەکاتەوە تەنها دەرپێکەی لە پێیا ئەمێنێ، سەیر ئەکا دەرپێکەشی جوانە، ئەڵێ: ئەویش داکەنە. ژنە ئەڵێ: پیاوی چاك بە من ماومەتەوە ئەم دەرپێیە. ئاخر چۆن ئەویش بدەم بە تۆ هەموو لەشم ئەکەوێتە دەرەوە. تۆ هیچ غیرەتی پیاوەتیت نییە؟

کابرای جەردە ئەڵێ: من ئەمانە نازانم ئەبێ دایکەنی.

لەو کاتەدا پیاوێکی ڕیش‌سپی نوورانی دەرئەکەوێ، ژنە ئەڵێ: ئەو پیاوە بکەین بە حەکەم و ناوجی و پرسی پێ بکەین؛ ئەگەر ئەو وتی: دایکەنە و بیدەرێ ئەوا ئەتدەمێ، ئەگەر خۆ نەشیوت، ئەوا هیچ. کابرای جەردە وتی: باشە.

پیاوەی پیر هات و ژنەش وا خۆی گرتمۆڵەکردووە و دانیشتووە، ڕووی کردە پیاوەکە و پێی وت: خاڵە ڕیش سپی! ئەم پیاوە منی ڕووت کردۆتەوە بەم جۆرەی لێ کردووم کە ئەمبینی. ئێستا ماوەتەوە سەر دەرپێکەم، ئەڵێ: ئەویشم بۆ داکەنە و بمدەرێ. تۆ ئەڵێی چی؟ پیاوەکە وتی: دایکەنە و بیدەرێ. کابرای جەردە ئیتر قسەی سوار بوو. ژنە چارناچار دەرپێکەی داکەند و ئەویشی دایە و خۆی گوڵۆڵە بوو دانیشت.

کابرای جەردە هەموو جلەکانی پێچایەوە دای بە شانیا و ڕۆیشت. زۆر دوور نەکەوتبووە کوتوپڕ بروسکەیەك لە سەرەوە هات، دای بە تەوقی سەری لە خواریەوە دەرچوو و کوشتی و جلوبەرگ لەو ناوەدا بڵاو بووەوە. ژنە بە هەرجۆر بوو خۆی گەیاندە جلەکانی و لەبەری کردنەوە و ڕووی کردە خاڵەی ڕیش سپی وتی: تۆ بۆچ وات کرد؟ خۆ من هانام هێنایە بەر

تۆ. خاڵە ڕیش سپی وتی:

ڕۆڵە من خدری زیندەم. بۆیە وام پێ وتی بۆ ئەوە کاسە پڕ ببێ. ئەگەر دەرپێکەت پێ نەدایە، کاسەکە پڕ نەئەبوو. زوڵم و ستەم کە گەیشتە حەدی خۆی، ئیتر ئەبێ سەرەولێژ بێتەوە!.

**٢٢٨.** «پاقلەی میسر»؛ لە داستانی کوردی ئەڵێ: لە سەردەمی خۆیا، واتە لە سەردەمی فیرعەونەکانا لە میسر ئەو «ئەهرامانە»ی کە ئێستە هەن، دروستکراون. هەموویشی بە دەست و شانی خەڵکی میسر کراون و ئەو خەڵکە وەکوو «قول»وە بەڵکوو هەر بەندەبوون لە بەردەستی فیرعەونەکانا.

ئەکەوێتە سەردەمی «دارم» کە یەکێک بووە لە فیرعەونەکانی میسر. دەنگەدەنگێک لەناو خەڵکا پەیدا ئەبێ کە ئێمە بۆچ بەم جۆرە بچەوسێنرێینەوە؟ ئەم ئەهرامە زل‌زلانە لەسەر شانی ئێمە دروست بکرێ؟

ئەم دەنگوباسە ئەگاتەوە بەرگوێ دارم. دارم لەگەڵ وەزیرەکانیا ئەکەوێتە ڕاوێژ کردن. وەزیرێکی ژیری ئەبێ ئەڵێ: ماوەیەك واز بێنە لە ئەهرام دروستکردن و چاری بخەرە ئەستۆی من. دارم ئەڵێ: باشە.

ئەمجا وەزیر فەرمان ئەدا کە لە هەموو وڵاتی میسرا دەست بکەن بە پاقلەچاندن. خەڵك ئەکەونە چاندنی پاقلە و پاقلەخواردن. چوار پێنج ساڵێك بەسەر ئەمەدا تێ‌ئەپەڕێ. ڕۆژێك لە ڕۆژان دوو کوڕی دراوسێ ـکە ماڵەکەیان بەرانبەری یەك ئەبێ ـ ئەبێ بە شەڕیان و شکات ئەگاتە لای وەزیر. وەزیرە بانگیان ئەکا و لێیان ئەپرسێ کە چییە؟

یەکێك لە کوڕەکان ئەڵێ: ئەو کوڕەی دراوسێم لە بەردەرگای

خانووەکەی خۆیا سنگێکی داکوتاوە؛ من قایل نابم بەوە. لەویکەیانی پرسی: بۆچ ئەو سنگەت داکوتاوە؟ ئەڵێ: ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەگەر پارەم هەبوو ئەسپێك ئەکڕم و لەوێدا ئەیبەستمەوە. لەویتر ئەپرسێ: ئەی باشە تۆ بۆچ نایەڵێ؟ ئەویش ئەڵێ: منیش ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان پارەم هەبوو ژن دێنم. کە ژنم هێنا منالّم ئەبێ، منالّەکانم ئەچن بەوێدا ئەسپەکە لەقەیان لێ ئەدا ئەمرن. لەبەر ئەوە نایەڵم سنگەکە داکوتێ.

وەزیر هەڵئەستێ ئەچێتەوە بۆلای دارم ئەڵێ: خەڵکەکە پێ‌گەیشتوون، دەست بکەرەوە بە ئەهرام دروستکردن!.

**٢٢٩.** لە داستانی کوردییە ئەڵێ: لەو سەرە لە ئەشکەوتێکا پیاوێکی «عابد» و خواناس تەرکی دنیای کردبوو، هەر خەریکی عیبادەت بوو. ڕۆژێك کوتوپڕ لەناو بەردەلانەکانا پارچەیەك قیر ئەدۆزێتە و ئەکەوێتەوە بیرکردنەوە کە ئەم قیرە چۆن کەوتۆتە ئێرە؟ ئەمە ئەبێ خوا بۆ منی ناردبێ بۆ ئەوە ئیشێکی پێ بکەم. بە خولیای ئەم بیرەدا ئەبێ، لە ئەنجاما دێتە سەر ئەوە ئەڵێ:

من لەم شوێنەدا عیبادەت ئەکەم و تەرکی دنیام کردووە؛ عیبادەتیش هەتا چەوسانەوەی زیاتری تیا بێ خێری زۆرترە. من دوو چاوم هەیە؛ دوو چاو ئیسرافە. دووەم بۆچییە؟ بە یەك چاو ئەتوانم کاروباری خۆم بەرم بەڕێوە. خواش ئەم قیرەی هەر بۆ ئەوە ناردووە. قیرەکە هەڵئەگرێ و ئەیخاتە سەر چاوێکی و بە قیرەکە چاوێکی ئەبەستێ.

ماوەیەکی زۆر بەم جۆرە نوێژ و عیبادەت ئەکا. ڕۆژێك لە ڕۆژان عالمێك بەناوبانگیەوە ئەچێ بۆ زیارەتی. سەیر ئەکا چاوێکی بە قیر بەستووە. لێی ئەپرسێ: ئەوە بۆچ قیرت ناوە بە چاوتەوە؟ ئەڵێ: وەڵڵا ئیسرافە، من

کە تەرکی دنیام کردووە و عیبادەت ئەکەم، تاقە چاوێك ئێشی من ئەبا بەڕێوە؛ ئیتر دووم بۆ چییە؟ ئەڵێ: چەند ساڵە وات کردووە؟ ئەڵێ: پانزە ساڵە. ئەڵێ: دەسا ئەبێ نوێژی پانزە ساڵت بگێڕیتەوە؛ چونکە چاوت تەڕ نەبووە و ئاوی لێ نەکەوتووە!

٢٣٠. لەو سەرە مەلا وەیسی «جفار» هەبوو بەهۆی ڕمڵ و جەفرەوە دەستی بۆ عەرش و قورش درێژ ئەکرد و پاشەڕۆژی هەموو شتێکی لێك ئەدایەوە و ئەیدا بەدەستەوە. ڕۆژێك کابرایەك ئەچێتە لای پێی ئەڵێ: تۆ ئەم هەموو شتە ئەزانی و ئەم هەموو نهێنیانە ئاشکرا ئەکەی، کەچی ئاگات لێ نییە ژنەکەت لە ماڵەکەی خۆتا ماڵەکەتی کردووە بە ماڵی باجی زەمزەمەوە؛ چوار ئەڕوا و هەشت دەرئەچێ.

مەلا وەیسی کە ئەمە ئەبیستێ شێت و هار ئەبێ. شیر و خەنجەر و دەمانچە هەڵئەگرێ بە پەلە ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە ژنەکەی بکوژێ. کە نزیکی ماڵ ئەبێتەوە ئەکەوێتەوە بیری کە ئەو هیچ ژنی نییە!.

٢٣١. لە داستانی کوردییە ئەڵێ: لە سەردەمی خۆیا پادشایەکی زۆر بەدەسەڵات هەبوو تووشی نەخۆشییەکی زۆر ناهەموار بووبوو. هەرچەندی ئەکرد بۆی چار نەئەکرا، هەموو پزیشك و حەکیمەکانی وڵات سەریان لەم نەخۆشییە سوڕ مابوو، بۆیان دەرمان نەئەکرا. هەر دەرمانێکیان ئەدایە پادشا ڕۆژبەڕۆژ خراپتر ئەبوو. لە ئەنجاما پزیشکێکیان لە وڵاتی چینەوە هێنا و ئەو لە پاش ئەوە کە سەیری پادشای کرد وتی: پادشا چاك ئەبێتەوە بەو مەرجە ئەو دەرمانەی من داوای ئەکەم دەستکەوێ. پادشا و هەموو وەزیر و پزیشکەکان بەم خەبەرە بە تەواوی گەشانەوە و وتیان: هەر بەو مەرجە پادشا چاك بێتەوە دەرمان ئەگەر لە بنی ئەرزیشا بێت

پەیدای ئەکەین. وتی: دەرمانی ئەم دەردەی پادشا، خوێنی مناڵێکی سوورکاری موو زەردی چاوڕەشی گۆنا پانی حەو ساڵانە کە بدرێ لە لەشی و پێی بهەنووێ تا سێ جار، ئیتر چاك ئەبێتەوە و ئازار لە لەشیا نامێنێ.

ئەمجا کەوتنە قەڵەمڕەوی پادشا بۆ دۆزینەوەی مناڵێکی وەها. هەرچەندە گەڕان مناڵێکی بەو تەرحەیان دەست نەکەوت. کەلێن و قوژبن نەما، شار نەما، دێ نەما، کەلکی نەبوو. لە ئەنجاما وتیان: لەم وڵاتە پان و درێژەدا تەنها ئاشێك ماوە کە ئاشەوانێکی لێیە و نەگەڕابین؛ ئەگینا شوێن نەماوە نەمان پشکنیبێ. وتیان: با بچین بۆ ئەو ئاشەش بزانین هیچ هەیە؟ کە چوونە ئاسیاوەکە سەیریان کرد تەنها ژن و پیاوێك و مناڵێکە و هیچی تر. کە سەیری مناڵەکەیان کرد تەماشایان کرد ئەو شتانەی کە پزیشکەکە وتوونی، هەموو لەم مناڵەدا هەیە. بە ژن و پیاوەکەیان وت: ئەم مناڵە چیتانە؟ وتیان: تاقە کوڕمانە و لەمە زیاتر هیچی ترمان نییە.

ئیتر پیاوەکان دەنگیان نەکرد و هاتنەوە خەبەریان هێنایەوە بۆ پادشا کە مناڵێکی بەو جۆرەمان لە ئاشەکۆنێکا دۆزیوەتەوە. پادشا و وەزیر و پزیشکەکان لەم خەبەرە وەکوو دنیایان سەرلەنوێ پێ درابێتەوە چ خۆشییەك ئەکەن؛ بەو جۆرەیان بەسەر هات.

ئەمجا پادشا ناردی ئاشەوان و مناڵەکە و دایکەکەیان هێنا، مناڵەکەیان بردە لای پزیشکی چینی چاوی پێ کەوت وتی: ئەو مناڵە کە من ئەیڵێم و دەرمانی دەردی پادشایە ئەمەیە. ئیتر کەوتنە سەر ئەوە کە چۆن ئەم مناڵە لەو دایك و باوکەی بستێنن؟

عالم و وەزیر و پزیشك هەموو چوونە بن دەست باوك و دایکەکەیەوە کە پادشای مەملەکەت نەخۆش کەوتووە و بەو نەخۆشییە ئەمرێ. ئەگەر خوێنی مناڵێکی وا نەدرێ لە لەشی و بمرێ، مردنی پادشا مردنی هەموو

مەملەکەتە. ئێستە ئێوە بێنن ئەم منالە بدەن بە پادشا و بیکەن بە قەزاوەگێڕی ئەو. پادشا بە گرانی منالەکە زێڕ و زیوتان ئەداتێ. باوك و دایك کە گوێیان لەم قسەیە بوو هەناویان هاتە خوارەوە و وتیان: شتی وا نابێت.

بەرە بەرە خەڵکی‌تر سەریان کردە سەریان و وتیان: سەلامەتی پادشا لە ماڵ و ئەولاد واجبترە لەسەر هەموو کەسێك. ئێستە ئێوەش تازە لە بەهاری جوانیدان منالی‌ترتان ئەبێت. وا بزانن ئەم منالەتان هەر نەبووە. ئەوەندە خەڵك سەری کردە سەریان و ئەوەندەیان چرپاند بە گوێچکەیانا، ڕازی بوون!.

منالیان لێ سەندن و بە سەنگی منالەکە زێڕ و زیویان دانێ و منالیان برد بۆلای پادشا. پادشا وتی: بیبەن بۆلای قازی. قازیش وتی: بۆ سەلامەتی سەری پادشا ڕشتنی خوێنی بێ‌گوناحێك واجبترە لەوە کە پادشا بمرێت. پادشا خوای سەر زەوییە، لە نەمانی ئەو زۆر و ستەم پەیدا ئەبێت و بڵاو ئەبێتەوە. لە نەمانی یەکێك لە ئەهلی مەملەکەت هیچ ڕوو نادا. کەواتە شەرع ڕێ ئەدا بۆ سەربڕینی ئەم منالە.

بەم جۆرە لە هەموو لایەکەوە بڕیار لەسەر سەربڕینی منالەکە درا، بە پادشا خۆیشیەوە، چونکە خوێنی ئەم منالە بۆ چاکبوونەوەی ئەو بوو. ئەمجا پادشا فەرمانی دا بە سەربڕین. جەلاد بە خۆی و کێردیەوە هاتە مەیدان. تەشتێکی لەولاوە دانا بۆ ئەمە کاتێ کە منالەکە سەر ئەبڕێ خوێنەکەی هەمووی بچێتە ناو تەشتەکە و هیچی لێی لە کیس نەچێ. دەستی منالەکەی گرت و هێنایە سەر پەقرەجەکە. پادشا و وەزیر و پزیشك هەموو لەولاوە دانیشتبوون سەیری ئەم دیمەنە ئەکەن.

کاتێ کە جەلادەکە منالەکەی هێنا، منالەکە چاوی بە جەلاد و کێردی

دەستی و تەشت کەوت دەستی کرد بە گریان و سەرێکی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و چەند جارێك لێوی بەیەکا دا و زەردەخەنەیەکیش گرتی. ئەم دیمەنە بەم جۆرە سەرنجی پادشای ڕاکێشا و بانگی کرد لە جەلادەکە منالّەکەم بۆ بێنە پێش ئەوە سەری ببڕی. جەلاد پەلی منالّەکەی گرت و بردیە بەردەمی پادشا. پادشا منالّەکەی دانا و لێی پرسی: ڕۆڵە ئەم گریان و لێو بەیەکا دان و زەردەخەنەیەت چی بوو لەم وەختەدا؟ منالّ وەکوو کانیاوی ئیلهامی خوایی ڕژابێ بەسەریا زمانی کرایەوە و وتی: پادشاهم هیچ؛ ئیشی خۆت بکە. پادشا وتی: ڕۆڵە ئەبێ هەر پێم بلّێیت. منالّەکە وتی: هەروەها؟ پادشا وتی: بەڵێ، ئەبێ بیلّێیت. ئەمجا کوڕە وتی:

دڵسۆزتر کەس و میهرەبانتر کەس بەچاو ئەولادەوە باوك و دایکە. باوك و دایکی من بە پارە منیان لە دەست کردەوە و دامیان بەدەست خەنجەری جەلادەوە کە سەرم ببڕێ. ڕەنگبێ ئێستە خۆیشیان لە گۆشەیەکەوە سەیری ئەم دیمەنە بکەن. ئەوا دەستم لە باوك و دایك بڕا.

یەکێ ئەگەر ستەمێکی لێ بکرێ ئەچێت بۆلای قازی دەردی زوڵم لێکراوی خۆی بەو ئەڵێ، بۆ ئەوە بەپێی شەرع و قانوون حوکمی بۆ بکا و نەیەڵێ ئەو زوڵمەی لێ بکرێ. کە ئیشی من کەوتە بەردەمی قازی، قازی فتوای دا کە بۆ سەلامەتی سەری پادشا، خوێنێکی ناهەق برێژێنرێ، دروستە. دەستم لەویش بڕا.

پاش ئەوە کە ئەگەر یەکێ ئیشەکەی کەس نەیپرسی، شکات ئەباتە لای پادشا بۆ ئەوە ئەو دادی بپرسێ و بە هانایەوە بێت. من ئیشم کەوتە لای پادشا و پادشاش وتی: ئەمە بۆ ساغ و سەلامەتی منە، ئەویش فەرمانی دا بە کوشتنم؛ بە کوشتنی منێکی بێگوناح.

ئیتر کەسم بۆ نەمایەوە. سەرم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، حەقمە بگریم،

چونکە سەرم ئەبڕن و نەمامی ژیانم لە ڕیشە هەڵئەکێشن. زەردەخەنەش لەو کاتە ناهەموارەدا گرتمی وتم: خوایە ئیشەکانت زۆر سەیرە، لێویشم کە بەیەکا دا وتم: خوایە کەسم بۆ نەماوەتەوە تەنها تۆ نەبێ.

پادشا کە گوێی لەم قسانە بوو سەری شۆڕ کردەوە بە بەردەمی خۆیا و پاشان هۆنەهۆنە فرمێسك هاتە خوارەوە بە چاویا. دەستی برد منداڵەکەی هەڵگرت خستیە سەر کۆشی خۆی و ماچی کردەوە و دەستی هێنا بە سەریا و وتی: ڕۆڵە! مانەوەی ژیانی من لە ڕشتنی خوێنی بێگوناحێکی وەکوو تۆ پێك بێت، من ئەو ژیانەم ناوێ. وە تۆ لە ئێستە بەدواوە ئیتر کوڕ و جێنشینی منیت. فەرمانی دا بە جەلاد کە کێرد و تەشتی خۆت لابە. ئەڵێ: کە پادشا ئەم میهرەبانییەی نواند، بەرەبەرە ئازارەکەشی لە کۆڵ کەوت و ئەلەمی تێدا نەما.

٢٣٢. قەزا و قەدەر هەیە. ئەمە شتێکە ڕاستە و بینراوە. لەو نزیکی خۆشناوەتییە پیاوێك کوڕێکی سێ چوار ساڵانی خۆی لەگەڵ ئەبێ، ئەچێتە دەرەوە بۆ سەر ڕەز و باخ. ئەگاتە سەر ڕەزەکە لە پاش هەندێك کوڕەکەی خەوی لێ ئەکەوێ. هەڵیئەگرێ لە بن دارێکا دایئەنێ، جامەدانەکەی خۆی ئەدا بەسەریا و خۆی ئەچێتەوە بەلای بێڵکارییەکەی خۆیەوە. خەریکی بێڵکاری ئەبێ کوتوپڕ بەدەم بێڵەکەیەوە دووپشکێکی گەورە دەرئەپەڕێ و ڕوو ئەکاتە منداڵەکە کە نوستووە.

کابرا بە بێڵەکەیەوە هەڕا ئەکا بە شوێنیا هەرچەندە ئەکا نایگاتێ. کابرا ئەیوت: ئەوا تەکان ئەدەم لە خۆم کە بیگەمێ کەچی وەکوو یەکێ لە دواوە پێی گرتبم، هەرچەندم ئەکرد نەئەڕۆیشتم. وتی: دووپشك لە دەستم دەرچوو ڕاست ڕووی کردە کوڕەکە و چووە ژێر جامەدانەکە و پاش

تۆزێك هاتەوە دەرەوە و ملی ڕێی گرت و بە شوێنەکەی خۆیا گەڕایەوە.

وتی: من لە تاو کوڕە، ئاگام لە دووپشك بڕا. چوومە سەر کوڕە و جامەدانەکەم لادا، سەیرم کرد مارێك قەفی خواردووە بە دەورەی کوڕەکەدا و سەری نزیکی بن ملی کوڕەکە کردۆتەوە، لەو کاتەدا دووپشکەکە گەیشتووە، چووە داویە بە تەپڵی سەری مارەکەوە! مار هەر لەجێی خۆی ڕەق بووە و ئیتر ڕاست گەڕاوەتەوە!.

وتی: کە ئەوەم دی چاوم بە دووپشکەکەش کەوت لە گەڕانەوەکەیا وە منیش ئیتر گورج بوومەوە ئەمتوانی بیگەمێ، بەڵام کە ئەو کارەساتەم دی، نەچووم بەشوێنیا وازم لێ هێنا تا چووەوە کونەکەی خۆی!.

**٢٣٣.** لە هەولێر خدربەگی ئەحمەدپاشا پرسەی هەبوو. لەگەڵ شێخ بەشیر ئەترووشی و شێخ ئەحمەدی نەقشبەندی لە ڕۆژی (١٩٧٦/١٢/١٢) چووین بۆ ئەو پرسەیە. قسەی مردن هاتە ناوەوە خدربەگ گێڕایەوە وتی:

ساڵێك لەگوندی «قازیخانە» لە دیواخانی حسێنی مەلادا دانیشتبووین. زۆر بووین، باسی مردنی مەڕ هاتە گۆڕێ کە ئەو ساڵە مەڕ قڕانی کردووە. یەکێ وتی: من بیست سەرم مردووە. یەکێ وتی: من سی سەرم مردووە. یەکێ وتی: من پەنجا سەر. هەریەکە شتێکی وت. یەکێ وتی: ئەوە مەڕ چۆن ئەمرێ بەم جۆرە؟ کابرایەك هەبوو «مستەفابۆر»ی ناو بوو، ساغ و سەلیم لە ئێمە ساغتر. هەر هەڵسا لە ناوەڕاستی دیواخانەکەدا لە بەرچاوی ئێمەوە ڕاکشا و وتی: وا ئەمرێ. دەستی کرد بە دەست و قاچ وەشاندن و لرخەلرخ کردن، ئیتر هەڵنەستایەوە. کە لێی کۆ بووینەوە سەیر ئەکەین مردووە!.

**٢٣٤.** لەو ناوچەی «ئامێدی»ـیە ساڵێك دنیایەكی زۆر تووش و سارد بوو، لەوانە بوو قڕان ببێت. بەفر هەموو دنیای داگیر كردووە. پیاوێكی «هەراس» ناو لە گوند دەرئەچێ بۆ دار كردن. كەڵەگایەك لە گوندەكەدا شێت بووبوو چاوی سوور كردبوو، ڕاوی خەڵكی ئەنا و كەس نەیئەوێرا بەرچاوی كەوێ. وا دیار بوو بۆشیان ڕێ نەكەوتبوو بیكوژن. ئەو گایە كە چاوی بە كابرا ئەكەوێ لەو چۆڵەوانییەدا شوێنی ئەكەوێ. كابراش هیچ چەكێكی پێ نییە و گایەكەش ئەناسێ. هیچ چاری نامێنێ ئەشكەوتێك لە نزیكیەوە ئەبێ بە هەرجۆر بێ خۆی ئەكا بە كونی ئەشكەوتەكەدا.

گایەكە شوێنی ئەكەوێ، ئەو ناچێ بە كونی ئەشكەوتەكەدا. گەلێك خەریك ئەبێ هیچی بۆ ناكرێ. ئەمجا دێنێ لەبەر كونی ئەشكەوتەكەدا ئەكەوێ و پاڵ ئەدا بە كونەكەوە و كون ئەگرێ و كابراش وا بە ژووریەوە.

كابرا لە ژوورەوە لە سووچێكەوە كڕنووش دائەدا و لە فیكر كردنەوەدا ئەبێ. تۆزێ بەرچاوی ڕووناك ئەبێتەوە تەماشا ئەكا وا ڕەشەمارێك لەوبەریەوە پەپكەی خواردووە و نیوەی شوێنەكەی داگیر كردووە. كابرا بە جارێ هەناوی دێتە خوارەوە. لە دەرەوە گایەكە بەر كونەكەی لێ گرتووە، لە ژوورەوە ئەم مارە لە بەرانبەریەوە. لە ڕاستیدا دنیای لێ ئەبێ بە چەرمی چۆلەكە.

لەم فیكرانەدا بوو تەماشای كرد وا لە تەنیشتیەوە دووپشكێك بە ئەندازەی بستێك ڕووبەڕووی هات، هاتە سەر كەڵەمووستی پێی و بە لەشیا هەڵگەڕا و چووە تەوقەسەری و بە شوێنەكەی خۆیا گەڕایەوە و ڕووی كردە مارەكە. چووە سەر پشتی مارەكە گەڕا، گەڕا چووە سەر تەپڵی سەری دای بە كەللەی سەریەوە و ئەمجا لە سەری لاچوو، ڕووی كردە دەرگای ئەشكەوتەكە (وا ئەمیش هەر چاوی لێیە). گایەكە بەر كونەكەی

گرتبوو دای بە گاوە، گا بۆڕەیەکی لێ هەستا و لە شوێنەکەی خۆی جوولا، تۆزێ چوو بەولاوە کەوت و بەرکونە بەرەڵا بوو. دووپشك دیسان گەڕایەوە هاتەوە بۆلای «هەراس». وەکوو جاری یەکەم گەشتێکی بە لەشیا کرد و پاشان دابەزی لەو شوێنەوە کە هاتبوو لەو شوێنەوە لە چاو ون بوو.

هەراس وتی: پاشان کە هەستام چووم بەلای مارەکەوە دارم تێوەژەند تەماشا ئەکەم تۆپیوە. هاتمە دەرەوە پێش ئەوە لە کونەکە دەرچم سەیرم کرد گایەکە لەولاوە کەوتووە و هەر چوار پەلی ڕاکێشاوە. زانیم کە نەماوە. چوومە سەری تەماشا ئەکەم مردار بووەتەوە.

ئەم باسە شێخ ئەحمەدی نەقشبەندی بۆی گێڕامەوە.

٢٣٥. لە داستانی کوردییەوە ئەگێڕنەوە ئەڵێن: دوو پادشای بەدەسەڵات و ئامۆزای یەك بوون. ئاقاری قەڵەمڕەوی هەردووکیان پێکەوە بوو. کابرایەکی دەرۆزەکەر هەبوو لە وڵاتی یەکێکیانا دوو کچی شۆخوشەنگی هەبوو؛ خەرامانی ئەرمەن و پەلك سەوزی داستان هاوتایی نەئەکردن. ناوبانگی نازدارییان لە هەموو وڵاتا دەنگی دابووەوە. جوانی ئەمانە بەرگوێی هەردوو پادشا کەوتبووەوە. هاتنە سەر ئەوە کە هەریەکە یەکێکیان مارە کەن. نەسیب یەکی خستن. دوو نەمامی داستان بوون بە هاوسەری دوو شازادەی جیهان. ئەم دوو کچە لە گەڕانی بەر دەروازانەوە کەوتنە ناو تەلاری شاهی و مێرگ و مێرغوزاری شادییەوە. نانی جۆ و ڕەشکەی بەر دەرماڵان، بوو بە گەنمی بەهارە و شیر و شەکری ناو ماڵان. مەگەر خوا بیزانێ کەوتنە چ خۆشییەکەوە.

ڕۆژێ بە ڕێکەوت یەکێ لەو دوو پادشایە کە چووەوە بۆ ژووری حەرەمسەرا سەیری کرد وا ژنەکەی لە هەر تاقێکی ژوورەکەیا کەرتە نانی

ڕەقی داناوە و کەس لە ژوورەکەدا نییە، بە بەر تاقەکانا ئەسووڕێتەوە دەستی ڕاگرتووە ئەڵێ: خوا لەدەستتان نەبڕێ پەنجەیە نانم بدەنێ!. بە دەستەکەی تری تۆزێ نانەڕەق ئەخاتە ئەو دەستیەوە. توورەکەیەك لە ملیایە ئەیخاتە ناو توورەکەکە و ئەڵێ: خوا لێتان نەبڕێ. ئەچێتە بەر تاقێکی تر هەروەها، تا هەموو تاقەکان بەو جۆرە هەموو ئەگەڕێ. پاشان ئەڕوا ئەو جلە شڕانە کە لەبەریایە دایئەکەنێ. جلی خانمانە لەبەر ئەکا و ئەچێ لەسەر دۆشەك دائەنیشێ.

پادشا لەمە زۆر سەری سڕ ما. چووە ژوورەوە لە تەنیشتیەوە دانیشت و پێی وت: بانوو! تۆ شتی وا بۆ ئەکەی؟ خانم لە پێشا نەچووە ژێری. پادشا وتی: خۆم بە چاوی خۆم دیم. خانم سەیری کرد هیچ چاری نییە، وتی: ڕاستی پادشاهم! من وام لەناو هەموو ناز و نیعمەتێکا. لە هیچ شتێك ناتەواویم نییە، نە لە خواردن، نە لەبەر کردن، نە لە کەنیزەك و خوڵامان؛ بەڵام کرمێك لە سەرما جووڵەی ئەکرد وەختەبوو شێتم بکا. شەو و ڕۆژ بەوەوە ئەتلامەوە. لە ئەنجاما تێ‌گەیشتم کە ئەمە ئیشی چییە. من سەرەتا بە دەرۆزە و بە سواڵکردن فێر بووم، ئێستە ئەوەم لێ براوە، هیچ چارێکم نەدیوە ئەوە نەبێ کە بەو جۆرە خۆم شڕەبار بکەم و بە بەر تاقەکانا بسووڕێمەوە داوای نانەڕەقە لە تاقەکان بکەم. بەو جۆرە ئیتر حەسامەوە و هیچ دەردێکم نەما.

ئەمجا پادشاکەی تریش ڕۆژێ کە چووە ژوورەوە سەیری کرد ژنەکەی وەکوو ژنەی پادشاکەی‌تر بە بەر تاقەکانا ئەسووڕێتەوە داوای پارچە نانەڕەقیان لێ ئەکا و لە پاش تەواو کردنیان خۆی ئەکاتەوە بە خانمەکەی جاران.

پادشا لێی ئەپرسێ: بۆچ وا ئەکەی؟ ژنە وتی: پادشاهم: من سەرەتا سواڵکەر و گەدا بووم. بەو جۆرە کە تۆ منت بینی، لەبەر ماڵانا گەداییم

ئەکرد. ئێستە کەوتوومەتە سەر ئەم ناز و نیعمەتە. هەر جارە نەجارێك دێنم وەکوو پێشوو بە بەر تاقەکانا ئەسووڕێمەوە و ئەو تاقانە بەماڵەکان دائەنێم کە سواڵم لێ ئەکردن. ئەمجا خۆم بە خۆم ئەڵێم: تۆ سەرەتا وا بوویت، خۆتت لێ نەگۆڕێ. پادشا ناوچەوانی ماچ کرد و وتی: نەجابەت بە زاتە، نەك بە ئەسڵ و نەسەب.

٢٣٦. لە داستانی گوێ ئاگردانی کوردییە ئەڵێ: جارێك خدری زیندە لە دەشتێکا تووشی کابرایەکی ڕیش سپی پیسوپۆخل، چاودادڕاو و دەم خوار بوو. چوار کەری بە بارەوە دابووە پێش، لۆکەلۆك ئەڕۆیشت. لێی پرسی: تۆ شەیتان نیت؟ وتی: بەرێوەڵڵا هەوم یا خدری زیندە. وتی: بۆ کوێ ئەچی؟ وتی: بۆ کەسابەت ئەچم! شتێك پەیدا کەم بۆ منداڵەکانم. وتی: باری گوێدرێژەکانت چین؟ وتی:

ئەوەیان جەور و ستەمە. وتی: بە کێی ئەفرۆشی؟ وتی: بە پادشاهان. ئەوەی دووهەمیشیان حەسادەتە. وتی: بە کێی ئەفرۆشی؟ وتی: بە عالمەکان. وتی: ئەوەی سێهەمیان خیانەتە و گزی کردنە. وتی: بە کێ ئەفرۆشی؟ وتی: بە تجار و بازرگانەکان. ئەوەی چوارەمیش حیلە و فێڵە. وتی: بە کێی ئەفرۆشی؟ وتی: لە ژنان بەولاوە کەسی تر نییە!.

وتی: جا ئەم کڕیارانەت دەست ئەکەوێ؟ وتی: یا خدری زیندە! ئەگەر ئێوە لێم بگەڕێن و واز لە خەڵکەکە بێنن، هەمووی بە ڕۆژێك ساغ ئەکەمەوە!.

٢٣٧. لە داستانی ڕابردووە ئەڵێ: ناسری عەباسی (٥٧٥-٦٢٢)ی هیجری؛ کاتێ کە خەزنە و سامانی «عاضد»ی فاتمی (٥٥٥-٥٦٧) ی هیجری، کەوتە بەردەست و داگیری کرد، تەپڵێك لە

ژوورەکەی «عاضد»ا بوو ئەویشیان هێنا. کابرا تەپڵەکەی هەڵگرت و دەستی کرد بە لێدانی. کابرا کەوتە تڕکەندن. خەڵکەکە دەستیان کرد بە پێکەنین پێی. یەکێکی‌تر هەڵیگرت کە لێی دا ئەویش کەوتە تڕ کەندن.

خەڵکەکە لەمە تووڕە بوون و تەپڵەکەیان دڕی. لە پاشا پیاوی شارەزا هات پێی وتن: ئەم تەپڵە هی تڕ کەندن نەبووە، بەڵکوو چاکەی ئەم تەپڵە ئەوە بووە کە لە نزیکی هەرکەسێکەوە بوایە ئەو کەسە کۆڵنجی نەئەکرد. «عاضد» نەخۆشی کۆڵنجی هەبوو ئەو تەپڵەیان بۆ هێنابوو لە ژوور سەری خۆیەوە دائەنا؛ ئیتر ببڕای ببڕای کۆڵنجی نەئەکرد. خەڵکەکە لە دڕانەکەی زۆر پەشیمان بوونەوە، بەڵام تازە بێ‌کەڵك بوو.

**٢٣٨.** لە داستانی کوردییە ئەڵێ: جارێك کابرایەکی «بابی» چووە لای مەلایەك وتی: ئێوە هەر ئەڵێن ئیشەکانی خوا جێگای ڕەخنە نییە و کەس ناتوانێ ڕەخنە لە کاری بگرێ. من سێ ڕەخنەم لە ئیشی خوا گرتووە، بزانم تۆ ئەیسەلمێنی یان نا؟ مەلا وتی: فەرموو بیانڵێ. کابرا وتی: خوا شەیتان بە ئاگری جەحەنەم ئەترسێنێ لە کاتێکا کە خوا شەیتانی لە ئاگر دروست کردووە. یەکێك لە شتێك دروستکرابێ چۆن لەو شتە ئەترسێ؟

دووهەم بەلای ئێوەی ئیسلامەکانەوە وایە کە خێر و شەڕ هەمووی لە خواوەیە، هەرچی خوا نەیکرد نابێ. کەچی ئەگەر یەکێ ئیشێکی نابەجێ لەگەڵ یەکێکا بکا تۆڵە لەو کەسە ئەکەنەوە و ئەو بەگوناحبار دائەنێن.

سێیەم ئەڵێن: خوا لە هەموو شوێنێك هەیە، جێگا نییە ئەوی تێدا نەبێ. یەکێك لە هەموو جێگایەك بێ، ئەبێ هیچ نەڵێ؛ ئەبێ جارێك ببینرێ بۆ ئەوە قسەکە بچێتە سەر؛ کەچی ئەوەتی دنیا دنیایە هەتا ئێستە

نەبیسراوە یەکێك خوای چاوپێکەوتبێت.

مەلا وتی: ڕاستە قسەکانت، تۆزێ وەرە پێشترەوە تا وەڵامت بدەمەوە. بابی چووە پێشەوە. مەلا نەیکردە نامەردی خشتێکی کاڵ لە بەردەمیا بوو، خشتی هەڵگرت و دای بەسەر کابرادا سەری شکاند و خوێن فیچقەی کرد. وتی: ئەوە وەڵامەکەتە.

کابرا کە ئەمەی دی چوو بۆلای قازی شکاتی کرد. قازی ناردی مەلاکەیان هێنا و وتی: تۆ سەری ئەم کابرایەت شکاندووە؟ وتی: بەڵێ. وتی: بۆچی؟ مەلا وتی: ئەم کابرایە ئەڵێ: شەیتان لە ئاگر دروست کراوە بۆچ ئەبێ لە ئاگر بترسێ؟ کە خوا بە ئاگر ئەیترسێنێ. ئێمەش لە خاك دروستکراوین بۆچ ئەبێ لێی بترسین و سەرمان بە خاك بشکێت؟

دووهەم ئەڵێ: ئێمە ئەڵێین: خێر و شەڕ لە دەست خودایە. سەرەتا چارەنووس چی بێ ئەبێ بێتە جێ. ئینسان دەسەڵاتی قەدەری خوای نییە. من بە ئیرادەی خوا سەرم شکاندووە هیچ دەسەڵاتێکی منی تێدا نییە؛ بچێ ملی خوا بگرێت و داوای تۆڵە لەو بکاتەوە، من چیم.

سێیەم ئەڵێ: ئێمە ئەڵێین: خوا لە هەموو جێگایەك هەیە، ئەو ئەڵێ: ئەگەر هەبێت ئەبێ هیچ نەبێ جارێك ببینرێ. ئێستە بچێ بە هەرجۆر بووە بەڵکوو خوا بدۆزێتەوە و داوای خۆی لەگەڵ ئەوا بکا. یەکێ دەعوا لەسەر یەکێك دروست ئەکا ئەبێ یەکەکە دیار بێ، دەعوا لەسەر کەسی نادیار و نەبینراو قەد ناکرێ. لەسەر قسەی خۆی من موددەعی ئەو نیم چی داوە لە من؟

قازی ڕوو ئەکاتە کابرای بابی ئەڵێ: ئەمانەت وتووە؟ ئەڵێ: بەڵێ وتوومە، بەڵام بۆ ئەوەم نەوتووە سەرم بشکێنن. قازی ئەڵێ: باوکم حەقت بەسەریەوە نییە بڕۆ. کابرا ئەڵێ: ڕازی بووم، بەڵام شەرت بێ لەمەودوا

منیش دایکی ئەو کەسانە لە کەر بکێشم کە ئەم جۆرە قسانە ئەکەن و منیان فێری ئەم بەزمە کردووە!.

٢٣٩. لە داستانی گوێ ئاگردانی کوردییە ئەڵێ: جارێك مام ڕێوی پێش مەلا بانگدانی بەیانی لە ماڵ دەرچوو. سەیری کرد وا کەڵەشێرێك بە دەنگەجوانەکەی لەسەر دارێك قووقەقووق ئەخوێنێ. چوو بەلایەوە وتی: ئەوە بانگەکەت دا، وەرە خوارەوە با نوێژەکەمان بە جەماعەت بکەین. ئەویش وتی: ئاخر ئیمام هێشتا هەر نوستووە، با هەستێت ئەو وەختە منیش دێم قامەتی بۆ ئەکەم. مام ڕێوی وتی: لە کوێیە تا بچم خەبەری کەمەوە. درەنگە ئەترسم نوێژەکەمان بڕوا. کەڵەشێرەکە وتی: ئەوەتە لە پاڵ ئەو دارەدا نوستووە بچۆ خەبەری کەوە خێرت ئەگا.

مام ڕێوی چوو کە سەیری کرد وا تانجییەك لەوێ نوستووە، هەر چاوی بە تانجی کەوت لە ترسانا دەستی کرد بە تڕ کەندن و بۆی دەرچوو. کەڵەشێرەکە وتی: ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟ وەرە با جەماعەتەکەمان بکەین. مام ڕێوی وتی: دەستنوێژەکەم شکا. ئەچم ئەیشۆمەوە و دێمەوە!.

٢٤٠. سەیری ئەم ڕزق و بەشکردنە کە: گورگ ڕێوی ئەگرێ و ئەیخوا. ڕێوی ژیشك ئەگرێ و ئەیخوا. ژیشك مار ئەگرێ و ئەیخوا. مار چۆلەکە ئەگرێ و ئەیخوا. چۆلەکە کولە ئەگرێ و ئەیخوا. کولە زەردەواڵە ئەگرێ و ئەیخوا. زەردەواڵە هەنگ ئەگرێ و ئەیخوا. هەنگ مێش ئەگرێ و ئەیخوا. مێش مێشوولە ئەگرێ و ئەیخوا. مێشوولە مێروولە ئەگرێ و ئەیخوا. مێروولە هەر شتێکی بەرپەل کەوێ تێ ئەڕووکێ و ئەیخوا!.

٢٤١. لە داستانی کوردییە ئەڵێ: جارێك پەڕەسێلکەیەك لەسەر کۆشکەکەی سولەیمانی پێغەمبەر نیشتبووەوە، لەوبەریەوە

پەڕەسێلکەیەکی‌تر هەبوو ڕووی تێ‌کرد وتی: ئەبێ مێردم پێ بکەی. ئەویش ملی نەئەهێنایە بەر. ئەمیش باڵێکی ڕاوەشاند و وتی: دەسا وەڵڵا ئەگەر مێردم پێ نەکەی ئێستە ئەم کۆشکە ژێرەوژوور ئەکەم؛ بۆت سووتاوم!

سولەیمانی پێغەمبەر گوێی لەم قسەیە بوو بانگی کرد پێی وت: ئەوە تۆ چیت وا قسەی وا ئەکەی؟ وتی: یا پێغەمبەری خوا، قسەی عاشق هیچ لۆمەیەکی لەسەر نییە!.

## گێسکەکەی هەیاس

**٢٤٢.** ئەزانی داستانی گێسکەکەی هەیاس چۆن بووە؟

لە داستانی کوردییە ئەڵێ: هەیاسی خاس، جارێك لە سوڵتان مەحموود لەسەر کارەساتێك تۆرا و خۆی لێ ون کرد. چوو لە دێیەك لەلای پیاوێکی دەم سپی ئەو دێیە بوو بە سەپان. سوڵتان مەحموود ڕای‌سپارد: هەرچی کەلێن و قوژبنی مەملەکەت هەبوو گەڕان، ڕێ‌بەدییەکیان لە هەیاسەوە نەکرد.

سوڵتان بە تەواوی کەوتە پەرۆشەوە و کاروباری وڵاتەکەی لەبەر نەبوونی هەیاس بە تەواوی ئاڵۆزا. ئەمجا کەوتە سەر ئەوە کە بەڵکوو بە فێڵ بیدۆزێتەوە. جاڕی دا بە وڵاتا کە هەرکەس مەڕدار و شوانکارەیە، وە هەرکەس پیاوماقووڵ و کاربەدەستە ئەبێ لە فڵانەڕۆژدا هەموو لە بارەگای سوڵتان حازر بن و کەس دوا نەکەوێ. بۆ ئەو ڕۆژی ئەوانەی کە سوڵتان ئەمری دابوو هەموو حازر بوون. سوڵتان هێنای هەریەکە گیسکێکی دانێ، وتی: ئەمەی هەر لە ئێستەوە تا چل ڕۆژی‌تر هەریەکە گیسکی خۆی برد، لە دوای چل ڕۆژە بیهێنێتەوە، ئەم گیسکە زیاد بکا ئەدەم لە سەری، کەم بکا هەر ئەدەم لە سەری.

یەکێك لەو کەسانە کە لەناو ئەم حەشامەتەدا بوو ئەو کوێخا بوو کە هەیاس لەلایەوە بووبوو بە سەپان. عالەم هەریەکە گیسکی خۆی وەرگرت و ڕۆیشت. کوێخای لای هەیاسیش یەکێك بوو لەوانە. ئەم عالەمە بە جارێ هەریەکە لە عاستی خۆی کەوتە ترس و لەرزەوە و ڕێی ئەم ئیشەی بۆ بەدی نەکرا. گیسك ئەگەر شتی نادەیتێ مردار ئەبێتەوە، ئەگەر ئەیدەیتێ زیاد ئەکا، ئەگەر ژەمژەم ئەیدەیتێ هەر وەکوو خۆی نامێنێتەوە. ئەمەش ئەنجامەکەی سەر فەوتانی تێدایە.

کوێخای لای هەیاس لە هەموو کەس زیاتر کەوتە پەرۆشەوە. چونکە مەڕومالاتێکی زۆری هەیە و لە مەڕداریدا بە پسپۆڕ ناسراوە، کەچی لە ئەنجاما هیچی بۆ ناکرێ و ئەبێ سەری خۆشی تیا بدۆڕێنێ. هەر بە تەواوی کەوتە پەرۆشەوە. دنیای ڕووناکی لێ بوو بە شەوی تاریك. هەیاس پرسی: کوێخا ئەوە چییە وا خواردن و خواردنەوەت لێ هەڵگیراوە؟ وتی: ڕۆڵە، ئەمە کارەساتەکەیە. هەیاس وتی: ئەگەر ڕاستم لێ ناڵێیت من ئەم ئیشەت بۆ چار ئەکەم. وتی: کوڕم من ئەمە بایسی سەرمە. تۆ ئەگەر ئەمەم بۆ بکەی سەرم ئەستێنیتەوە، چۆن ڕاستت لێ ئەڵێم؟

هەیاس وتی: هەرچەندە بڕواش ناکەم، بەڵام نمەکم کردووی. ئەمەت هەر بۆ ئەکەم و ڕزگارت ئەکەم. بێنە بێچووە گورگێکم بۆ پەیدا کە و ئیتر تۆ ئیشت نەبێ.

کوێخا چوو بێچوە گورگێکی پەیدا کرد و هێنای دای بە هەیاس. ئەمجا هەیاس کەوتە ئیش. جارێ هێنای پێش هەموو شتێك ددانەکانی بێچووەگورگی هەڵکەند و ئەمجا بەستیەوە. هێنای گێسکی گرتە جۆ و قەرسیل، تێری ئەخوارد و قونەی ئەکرد. کە ئەکەوتە ئێوارە ئەیبرد بەلای بێچووە گورگەکەوە. گورگ کە چاوی پێ ئەکەوت پەلاماری ئەدا،

بەڵام بەسترابووەوە هیچی پێ نەئەکرا. گیسکیش کە چاوی بە گورگ ئەکەوت، هەناوی ئەکەوتە خوارەوە. ئەوی خواردبووی بە ترس دایئەنایەوە. ئەیبردەوە تێری ئەکردەوە، بۆ بەیانیش دیسان وای لێ ئەکردەوە. گیسکی بەستەزمان ئەوی ئەیخوارد بە ترس دایئەنایەوە. تا ماوەی چل ڕۆژ هەیاس ئەمە کاری بوو لەگەڵ ئەو گیسك و گورگەدا. پاش چل ڕۆژە وتی: بە کوێخا بیبەوە بۆ سوڵتان.

کوێخا گیسکی برد و چوو. عالەمی‌تریش هەریەکە بە خۆیان و گیسکی لای خۆیانەوە هاتنەوە. سوڵتان سەنگ و ترازووی هێنایەوە مەیدانەوە. دەستیان کرد بە گیسك کێشان. سەیریان کرد هەمووی زیادی کردووە، گیسکی واش بوو هەر ئێسقانەکەی مابوو، کەمی کردبوو. سەرە هاتە سەر گیسکی لای کوێخا. کە کێشایان سەیریان کرد لەگەڵ سەنگ و بەردی هەوەڵا هەر وەکوو یەك وایە؛ نە زیادی کردووە و نە کەم، لەگەڵ ئەوەشا هیچ نەخۆشییەکی نییە.

سوڵتان کە ئەمەی دەستکەوت لە خەڵکەکەی‌تریش خۆش بوو! وتی: بڕۆن من هەر مەبەستم ئەمەبوو وا دەستم کەوت.

ئینجا کوێخای هێنایە ژێر پرس و جوابەوە کە چۆن ئەم گیسکەت وا هێشتۆتەوە؟ ئەویش بەسەرهاتی گیسك و گورگی بۆ گێڕایەوە. وتی: کێ ئەم تەگبیرەی بۆ کردووی. وتی: هیچ‌کەس، هەر خۆم کردوومە. سوڵتان وتی: من ئەمانە نازانم یا ئەبێ پێم بڵێیت یا ئەتکوژم. خستیە ژێر ئەشکەنجەوە. لەولاشەوە بە هەیاسی وتووە کە دەنگ نەکا و ڕاستی پێ نەڵێ. کە ئیش گەیشتە ئەشکەنجە و شکەنجەکاری و سەر تیاچوون وتی: شاهم بەسە پێت ئەڵێم. وتی: کوڕێکی سەپانم لایە ئەم تەگبیرە، تەگبیری ئەوە.

سوڵتان ئەوا هەیاسی بە ئەقڵی خۆی دۆزییەوە. ئەمجا ناردی هێنایانەوە و ئاشتی کردەوە. کوێخاشی خەڵات کرد و ناردیەوە بۆ ماڵی خۆی، بە خۆی و بە گیسکیەوە.

٢٤٣. لە قسەی گوێ ئاگردانی کوردییە ئەڵێ: ڕۆژێك سوڵتان مەحموود و هەیاسی خاس بەناو بازاڕا ئەڕۆیشتن، تەماشایان کرد پیاوێکی ڕیش سپی سێ کۆمەڵە خۆڵی لەبەر دەمایە، هاوار ئەکا ئەڵێ: ئەم کۆمەڵە خۆڵانە هەریەکە گەوهەرێکیان لەناوایە، ئەیانفرۆشم. کێ ئەیەوێ بێت بیان کڕێ. سوڵتان مەحموود گوێی لە قسەی کابرا بوو وتی: ئەم کابرایە چەند گەوجە؛ ئەگەر گەوهەریان لە ناوایە بۆچ خۆی گەوهەرەکان هەڵناگرێ؟ هەیاس وتی: ئێستە من ئەچم بەلایەوە بزانم چییە.

چوو وتی: مامەی ڕیش سپی چۆنی ئەفرۆشی؟ وتی: کۆمەڵێك بە لیرەیەك. سوڵتان مەحموود وتی: ئەمە قسەیە؟ چۆن گەوهەرێك بە لیرەیەك ئەفرۆشرێ؟ هەیاس وتی: من ئەیکڕم. وتی: مامە ئەمە لیرەیەك و کۆمەڵێکم پێ بفرۆشە. وتی: دانیشە. دانیشت، مامە چێوێکی گرت بە دەستەوە نایە سەر کۆمەڵێك وتی: ئەگەر نهێنییەکت هەبوو بەلای ژنەکەتو نەیڵێی. هەیاس وتی: یەکێکی‌ترم پێ بفرۆشە. وتی: بێنە لیرەکە. لیرەی دایە و وتی:

هەرگیز پشت بە زاڵم مەبەستە و ڕووی خۆشی حاکم هەڵت نەخڵەتێنێ و ئەو کۆمەڵەشی تێك دا. مایەوە کۆمەڵێکی‌تر. وتی: ئەوەشم پێ بفرۆشە. وتی: بێنە لیرەیەك. لیرەی دایە و وتی: هەرگیز خزم بە بێگانە نەدەیت. ئەو کۆمەڵەشی تێك دا. هەیاس وتی: مامە بۆچی خۆڵەکەت بڵاو کردەوە؟ وتی: ئەوە یانێ ئەم خۆڵە بەسەر ئەو کەسە کە بەگوێی ئەم ئامۆژگارییانەی

من نەکات.

هەیاس لەگەڵ سوڵتان مەحموودا ڕۆیشتن. سوڵتان وتی بە هەیاس: بۆم دەرکەوت تۆ لەو پیاوە بێ‌ئەقڵتر و گەوجتریت. هەیاس وتی: باشە.

سوڵتان «خوشمێ»یەکی هەبوو زۆری خۆش ئەویست. خوشمێش ئەوەندە جوان بوو هەموو کەس هەر خۆشی ئەویست، بۆ خۆی بە ئارەزووی خۆی سەری بە هەموو ماڵ و دووکانێکا ئەکرد، کەس نەبوو ڕێگای لێ بگرێ. لەبەر ئەوە کە بەبێ سەروبەر بە هەموو لایەکدا ئەگەڕا؛ وا قەڵەو بووبووەوە هەر نەبێتەوە.

ڕۆژێك سەری کرد بە ماڵی هەیاسا. هەیاس ژنەکەی لە ماڵ نەبوو. چوو خوشمێی بردە ژوورێکی ژێر زەوییەوە شاردیەوە. مێیەکی هەروەکوو ئەوی هێنایە حەوشەکەوە. لەو وەختەدا ژنەکەی هاتەوە. وتی: ئافرەت ئەمە خوشمێی سوڵتانە، زۆر چاخە، خوا ناردوویە؛ قاپییەکە داخە سەری ئەبڕین با کەس پێ نەزانێ بۆ خۆمان ئەیخوێن. تۆیش دەنگ مەکە. ژنە قاپی داخست و هەیاس مەڕی سەر بڕی. گروویان، خستیانە دیزە و هەڵیان‌گرت.

یەك دوو ڕۆژ کە خوشمێ دیار نەبوو سوڵتان پیاوی خستە ناو شار کە بیدۆزنەوە. هەر دیار نەبوو. وتی: هەرکەس ئەم خوشمێیەی منی لەناو دابێ، سەری ئەبڕم. ئەم هەڕەشەشی کرد، ئیتر سۆراخی خوشمێ بە تەواوی بڕا و سوڵتانیش زۆر بۆی بێ‌تاقەت بوو.

ڕۆژێك هەیاس لەسەر شتێکی هیچ لەگەڵ ژنەکەیا بوو بە دەمەقاڵیان. ژنە وتی: تۆ ئەوە نیت کە خوشمێی سوڵتانت سەربڕی و لەناوت دا؟ هەر ئێستە ئەچم خەبەرت لێ ئەدەم. هەیاس وتی: ئافرەت! ئافرەتی چاك بە، من کردم تۆ نەتکردبێ. ئەگەر ئێستە تۆ بچیت خەبەر بدەی، سوڵتان

سەرم ئەبڕێ. ژنە وتی: من ئەمانە نازانم. عەزیەتی زۆرمت داوە، ئەچم هەقی خۆمت لێ ئەکەمەوە. هەرچەندە هەیاس دەستەودامانی بوو، بێکەڵك بوو. چوو بۆلای سوڵتان و وتی:

ئەم هەیاسە کە تۆ بە یەکەم دڵسۆزی خۆتت ئەزانی، ئەوەتا ئەو خوشمێکەتی لە بەرچاو منەوە سەربڕی. هەرچەندە هاوارم لێکرد شتی وا نەکەی بەگوێی نەکردم، وتی: هەر ئەبێ داخێك بەرمە دڵی سوڵتانەوە.

سوڵتان چووە دەریای غەزەبەوە، وتی: ئادەی هەیاسم بە باڵبەستە بۆ بێنن. هەر ئەبێ ئێستە خوێنی ئەویش بەرمە لای خوێنی خوشمێوە. هەیاسیان بە قۆڵبەستەیی هێنایە حوزوور. سوڵتان ڕووی تێکرد و وتی: ئەمە هەموو نمەکەکەت بوو؟ کە ئەتزانی من ئەو خوشمێیەم چەند خۆش ئەویست، تۆ بچیت سەری ببڕی و بەو جۆرە من تووشی خەفەتی ئەو بکەی؟ ئادەی جەلاد سەری لە لەشی جیا کەرەوە.

سوڵتان بەرگی غەزەبی پۆشیبوو، هەرچەندە هەیاس وتی: پادشاهم من شتی وام نەکردووە، بێکەڵك بوو. وتی: لە ژنی خۆت بەولاوە کەسیتر هەیە کە بەو جۆرە لێتەوە نزیك بێ؟ ئەو هاتووە خەبەری لێ داوی. گوایە ئەو درۆ ئەکا و تۆ ڕاست ئەکەی؟.

لەبەر ئەوە کە سوڵتان چووبوو بە غەزەبا ئەو هەموو دۆست و ناسراوە کە هەیاس هەیبوو لێی کشانەوە و وتیان: یەکێ ئەوەندە بەدنمەك بێ هەر کوشتنی باشە. دەستی خۆش بێ سوڵتان با بیکوژێ.

هەندێ خزمی ڕووتەڵە و هەژار و فەقیری هەیاس هەبوون، کە بیستیان وا سوڵتان مەحموود هەیاس ئەکوژێ، هەر یەکە چی بەرپەل کەوت لە دار و تێلا کۆ بوونەوە و بە هەراهەرا و دەنگەدەنگ بەر بارەگای سوڵتانیان گرت، وتیان: یا ئەمەیە ئەبێ ئێمەش سەر بڕی یا ئەبێ لە خوێنی هەیاس

خۆش ببی.

سوڵتان مەحموودیش چووەتە بەرگی غەزەبەوە و لە قسەی خۆی نایەتە خوارەوە، ئەڵێ: هەر ئەبێ بکوژرێ. خزمەکانیشی ئەڵێن: ئەبێ لە پێشا ئێمە بکوژی ئەو وەختە هەیاس بکوژە.

ئیش کە گەیشتە ئێرە هەیاس بانگی کرد: پادشاهم! مەمکوژە خوشمێت ئەوا لە ژووری ژێر زەوی ماڵەکەی منایە بنێرە بیهێننەوە. سوڵتان زۆر سەری سوڕ ما. لە ڕاستیدا ناردی هێنایان سەیری کرد، ڕاستە خوشمێکەی خۆیەتی. هەستا دەستی کردە مل هەیاس، ماچی کردەوە و داوای لێبوردنی لێ‌کرد.

هەیاس وتی: پادشاهم من و تۆ تازە پێکمانەوە نامانکرێ. بەڵام ئەمە ئەو سێ کۆگا خۆڵە بوو کە لە مامەی ڕیش‌سپیم کرِی و تۆ وتت: تۆ لەو گەوجتریت. من ویستم هەر سێکت بخەمە بەر چاو.

من بەدنمەك نیم. ڕۆژێك خوشمێ هاتە ماڵی ئێمە، من بردم شاردمەوە مەڕێکی‌ترم هێنا و بە ژنەکەمم وت: ئەمە خوشمێی سوڵتانە، سەری ئەبڕین و دەنگ مەکە. ئەگەر سوڵتان پێی بزانێ سەرم ئەبڕێ. ژنەکەم ئەو نهێنییەی ڕانەگرت و هاتە لای تۆ ئەوەی وتی، وتی.

دووهەم من دۆست و خەڵکێکی زۆرم بە دەورەوە بوو، کە چاکەم بۆ هەموویان بووبوو، کە هاتە وەختی تەنگ و چەڵەمەی ناخۆشی، هەموویان پشتیان تێ‌هەڵکردم و لێم تەکینەوە. ئەوەی کە هات بە هانامەوە تەنیا خزمە هەژارەکانی خۆم بوون کە هیچ چاکەیەکیشم بۆیان نەبووبووە، وە بەڵکوو هەموو دەم هەر لێیان دوور ئەکەوتمەوە.

سێیەم ئەوە بوو وتی: بە قسەی خۆشی پادشا هەڵنەخەڵەتیت؛ ڕاست بوو، ئەم هەموو لوتف و میهرەبانییەی کە تۆ لەگەڵ منت هەبوو، هەمووت بە مەڕێك گۆڕایەوە.

ویستم سێ گەوهەرەکەی مامەی ڕیش سپیت سووراوسوور پیشان بدەم و خۆت بە چاوی خۆت بیانبینی.

هەیاس ئەمانەی وت و لێی دا ڕۆیشت، تۆرا. سوڵتان مەحموود گەلێ بەشوێنیا گەڕا نەیدۆزییەوە تا بەهۆی کارەساتی گیسکەکەوە دۆزیەوە و ئاشتی کردەوە. هەیاسیش ئیتر لەو وەختە بەدواوە خزمەکانی خۆی لە خۆی کۆکردەوە، ئەو پشتەی کە جاران بە خەڵکی ئەبەست، بەوانی بەست!.

٢٤٤. ئەمە کارەساتێك بووە کە بە داستانی گوێی ئاگردان لەناو کورددا ئەیگێڕنەوە، لە وێنەی ئەمە کارەساتێك کە ڕووی داوە و داستان نییە، هەر لە ڕاستیدا ڕووی داوە، ئەمەش بۆ ڕووداوی مێژوو ئەگێڕمەوە:

زستانی ساڵێ (١٩١٩) زستانێکی سەخت و تووش بوو. گرانی گەورەش هێشتا پاشەلەقەی مابوو. بێ حوکومەتی و بێ ئارامی، خێوەتی ڕەشی خۆی بەسەر وڵاتا هەڵدابوو.

«میرزا سیف الله» هەبوو لە سنە پیاوێك بوو خۆی بەخۆی پێگەیشتبوو، دەوڵەمەند بووبوو. بووبوو بە خاوەن پارە. ماڵەکەی تۆزێ کەوتبووە قەراخ شارەوە، هەر خۆی و ژنەکەی بوو لەو ماڵە گەورەدا، «ژێرماڵە»یەکیشیان هەبوو.

ژێرماڵە ئەوە بوو کە ئەهلی لادێکان لەبەر لێشاوی عرووس و لەبەر فەلاکەتی گرانی ڕوویان ئەکردە شارەکە. ئەو ماڵەی کە تۆزێ حاڵی باش بوایە ژێرخانێکی ئەدا بە یەکێ لەوانە، بەبێ ئەوە پارەی لێ وەربگرێ. ئەوانیش خزمەتی ماڵەکەیان ئەکرد؛ لە بان ماڵین، لە نان کردن و حاجەت ششتن. دیسان خاوەنماڵیش یارمەتی خواردەمەنی و جلوبەرگی

کۆنەشی ئەدان. بەمانەیان ئەوت: «ژێرماڵە».

میرزا سەیفوڵڵا ژێرماڵەیەکی وای خەڵکی دێی «خرۆسە»ی لە ماڵا هەبوو. ئەم ژێرماڵەیەش هەر خۆی و ژنەکەی بوو. شارەزای هەموو سووچێکی ماڵەکە بووبوو. تەنانەت ئەیزانی سندووقی پارەکەی میرزا سەیفوڵڵا و دەمانچەکەشی لەکوێیە.

ئەم کابرای ژێرماڵە لەگەڵ سێ کەسی تری خەڵکی دەرەوەدا قسە ئەکا بەیەك کە شەو لە ناکاوێك بێن، ئەم قاپی حەوشیان بۆ بکاتەوە، میرزا سەیفوڵڵا خانەبگیر بکەن. (خانەبگیر ئەوە بووە کە بە شەو دەستەیەك ئەچنە سەر ماڵێك، بەبێ تەقە و هەرا ئەچنە ژوورەوە. خاوەن‌ماڵ ئەگرن و ئەیکوژن. نەختینە و شتی‌تر کە بە وەزن سووك و بە قیمەت گرانە ئەیبەن و ئەڕۆن. حوکمەت و شتەش نییە تا شوێنیان کەوێ. ئەو هەژارە هەم سەری ئەڕوا هەم ماڵی).

شەوێکی تۆف و بەفر و تاریك سێ کەسەکە دێن -کە پێشتر ژوانیان گرتبوو- کابرای ژێرماڵە قاپی حەوشەیان بۆ ئەکاتەوە و قاپی لەو دیوەوە دائەخەن. میرزا سەیفوڵڵا و ژنەکەشی نوستوون. پێش هەموو شتێ ئەچن دەمانچەکە لە ژێر سەریا دەرئەکەن. ئەمجا چرا هەڵئەکەن و بەر دەماخ ئەدەن. میرزا سەیفوڵڵا هەڵئەستێنن و بەر ئەبنە سەر و پۆتەلاکی. یەکێکیان دەست ئەگرێ بەسەر دەمیا نایەڵێ دەنگیشی دەرچێ. ژنەکەشی سەرینێك ئەخەنە سەر دەمی و ژنی کابرای ژێرماڵەی بەلاوە دائەنێن تا خەفە ئەبێ.

میرزا سەیفوڵڵا هەرچەندە ئەپاڕێتەوە و هاوار ئەکا بێ‌کەڵك ئەبێ. ژێرماڵەکەی خۆی ئەناسێتەوە ئەڵێ: کوڕە ئەمە پیاوەتی نییە تۆ ئەیکەی ئەتناسم. چیم هەیە ببیەن مەمکوژن. ژێرماڵەکە ئەزانێ ناسیویەتەوە چەقۆیەك دێنێ بە ملیا سەری ئەبڕێ. بیرێك لە حەوشەکەدا ئەبێ

لاشەکەی ئەخەنە بیرەکەوە.

ئەمجا بە شێنەیی سندووقە پارە و زێڕ و زیو و نەختینەی‌تر چی ئەبێ ـ کە کابرای ژێرماڵە شارەزای هەموویەتی ـ ئەیهێنن لەسەر کورسییەك بەشی ئەکەن و هەرکەسە بەشی خۆی ئەخاتە تەنکەی باخەڵی و لێ ئەدەن ئەڕۆن. ژێرماڵەش قاپیان لەسەر دائەخاتەوە و ئەویش لەگەڵ ژنەی خۆیدا ئەخەوێ. بەیانی هەرا پەیدا ئەبێ کە ماڵی میرزاسەیفوڵڵا خانەبگیر کراوە. ژێرماڵەش ئەڵێ: من ئاگام لە هیچ نییە.

بەشوێنی چۆڕاوگەی خوێنەکەدا لەشەکە لە بیرەکە ئەدۆزنەوە، دەری ئەکەن و ئەینێژن. ڕێکەوت چۆن ئەبێ، خزمێکی میرزا سەیفوڵڵا ئەبێ «ئاغەباوا»ی ناو ئەبێ، دووکانی عەتاری ئەبێ لەلای مزگەوتی «حاجیەولەسەن». ئەو شەوە کە میرزا سەیفوڵڵا ئەکوژرێ یەکێ لە دزەکان لە بەیانیدا ئەچێتە لای ئاغەباوا شت بکڕێ، کیسە و یەنمۆرەکەی میرزا سەیفوڵڵا لای ئەو ئەبێ. کیسە و یەنمۆرەکەی دەردێنێ و پارە دەرئەکا. ئاغەباوا چاوی پێ ئەکەوێ، ئەیناسێتەوە کە ئەمە هی میرزا سەیفوڵڵایە، بەڵام هێشتا خەبەری کوشتنی ئەوی نەبیستووە.

کابرا ئەڕوا، لە پاشا کوشتنی میرزا سەیفوڵڵا بڵاو ئەبێتەوە. ئاغەباوا خۆی ئەیگێڕایەوە ئەیوت: لە ترسی ئەوە کە نەوەك ئەو دزانە بڵێن: ئەویشمان لەگەڵ بووە، هەر دەنگم نەکرد، چونکە دنیاکە زۆر بێ‌سەروبەر بوو. لەوانە بوو حوکمەتە پووچەڵەی ئەو وەختە منیان بگرتایە و دزیش لەولاوە بۆ خۆی دەربچوایە.

لە پاش یەك دوو ڕۆژ ژێرماڵەکەش لە ماڵی میرزا سەیفوڵڵا بار ئەکا و ئەڕوا. ئەو کەسانە کە ئەو ئیشەیان کردبوو هەموو هیچوپووچ و نەدارا بوون. گەلێ لە خەڵکی شارەکە ئەیانناسین کە هەژار و لاتن؛ چونکە

ئەچوون قورەکارییان ئەکرد ڕۆژێ بە قڕانێ یا قڕان و نیوێك. ئەو پارەیە بە کوڵەمەرگی بەشی ئەکردن. چونکە تا ڕۆژێ عەمەلەییان دەست ئەکەوت چوار ڕۆژ دەستیان نەئەکەوت. کەچی لەدوای ئەو کارەساتە بە بێڕەحمانە پارەیان خەرج ئەکرد و ئەیان خوارد. خەڵکەکە ئەمەیان ئەزانی، بەڵام قەت دڵیان بەلای ئەوەدا نەئەچوو، کە ئەمانە تاوانێکی وایان کردووە. حوکمەتێکی ڕێکوپێکیش لە ناوا نەبوو تا لە ئیش بکۆڵێتەوە.

لە پاش ماوەیەك لە سەردەمی حوکمەتی «شریف الدّولە»دا ژنی کابرای ژێرماڵە لەگەڵ مێردەکەیا ئەبێ بە شەڕیان. ژنە سێ و دووی لێ ناکا ئەچێتە لای شەریفوددەولە ئەڵێ: مێردەکەی من لەگەڵ سێ کەسی‌تر میرزا سەیفوڵڵایان کوشتووە.

شەریفوددەولە ناو و نیشانی کابرا وەرئەگرێ و ژنە لای خۆی گل ئەداتەوە، دەم و دەست ئەنێرێ کابرا ئەگرن. کابرا ئەخاتە ژێر شکەنجەوە ڕاستی سێ کەسەی‌تریشی پێ ئەڵێ و ناو و نیشانی ئەوانیش لەو وەرئەگرێ. سێ کەسەکە یەکێکیان هەر لەناو شار مابوو. دووەکەی‌تر چووبوونە دەرەوە. ئەنێرێ ئەوانی‌تریش پەیدا ئەکەن و ئەیانگرن. هەموو دان ئەنێن بەوەدا کە ئەوان میرزا سەیفوڵڵایان کوشتووە.

شەریفوددەولە لە ئەنجاما هەرسێکیان تیرباران ئەکا و ژنەکەش بە حەپسێکی درێژ حەپس ئەکا.

ئەم کارەساتی خانەبگیر کردنی میرزا سەیفوڵڵایە لە سەردەمێکا بوو کە «ابوالحسن خان»، «سردار محی رشتی» سنە بووە.

٢٤٥. جارێك پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیا لە ماڵا کەوێکی سوورەوەکراویان لە بەردەما بوو، ئەیان خوارد. لەو وەختەدا

هەژارێك هاتە بەر دەرگا، داوای شتێکی لێ کردن، پیاوەکە هەستا چووە دەرەوە دەری‌کرد و گەلێ قسەی ناشیرینیشی پێ‌وت!

زەمان پشتی لە کابرا هەڵکرد، ماڵ و سامان نەما و ژنیشی تەڵاق دا؛ ژنە چوو مێردی کرد بە پیاوێکی‌تر، ڕۆژێك لە ڕۆژان ژنە لەگەڵ مێردەکەیا بە خۆشی دانیشتبوون، کەوێکی سوورەوەکراویان لە بەردەما بوو، دەستیان درێژ کرد بۆ خواردنی و نەیانکرد، سواڵکەرێك هاتە بەر دەرگاکە وتی: لە ڕێی خوادا شتێکم بدەنێ بیخۆم. پیاوە بە ژنەکەی وت: بچۆ ئەم کەوەی بەم نانەوە بۆ بەرە با بیخوا. ژنە چوو، سەیری کرد ئەمە مێردە کۆنەکەیەتی! نانەکەی دایە و بە گریان گەڕایەوە.

مێردەکەی پرسی: ئەوە بۆچ ئەگری؟ ئەویش کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە: کە ژنی ئەو پیاوە بووە و جارێك کەوێك لە بەردەممانا بوو، فەقیرێك هات داوای شتێکی کرد بیخوا، ئەویش چوو دەری‌کرد و گەلێ قسەی ناشیرینیشی پێ‌وت. پیاوەکە وتی: دەسا وەڵڵا ئەو هەژارە کە هاتە بەر دەرگاکەتان، ئەوە من بووم!.

٢٤٦. لە داستانی کوردەوارییە ئەڵێ: جارێك پادشای شارێك مرد و یەکێکی‌تر بەبێ قسە هات نیشتە شوێنەکەی و خۆی کرد بە پادشا. هەر شتێکی کرد ـ لە چاکە یا خراپە ـ کردی و درێغی نەکرد. پادشاکەی پێشوو وەزیرێکی زۆری هەبوو، یەکەیەکە بانگی کردنە لای خۆی و ئەم پرسیارەی لێ ئەکردن کە: «ئایا من خوا هێناومی یا خۆم هاتووم؟»

ئەو کەسەی کە ئەیوت: خوا هێناوتی، ئەیدا لە ملی ئەیپەڕاند. ئەو کەسەش کە ئەیوت: خۆت هاتووی و بە ئازایەتی خۆت بوویت بە پادشا ئەیدا لە ملی ئەویش؛ ئەویشی هەر ئەکوشت.

ئەمە بوو بە بەڵایەکی گەورە بەسەر وڵاتەکەوە. هەرکەس هەر شتێکی ئەوت لە کوشتن بەولاوە هیچی‌تری دەست نەئەکەوت. ئەمجا سەرە هاتە سەر خەڵکی‌تر. ئەنجامی ئەوانیش وەکوو ئەنجامی وەزیرەکان بوو. پیاوێکی پیر مابوو، سەرە هاتە سەر ئەو. پیاوە هەر سەرەی گەیشتە سەر بە جارێ هەناسەی لێ بڕا، چونکە ئەیزانی بەشی ئەویش وەکوو بەشی ئەوانی‌ترە.

کوڕێکی منداڵکاری هەبوو کوڕە وتی: باوە من بنێرە جوابی ئەدەمەوە. باوکەکە وتی: ڕۆڵە ئەم هەموو عالەمە نەیان‌توانیوە جوابی بدەنەوە، ئێستە تۆ چۆن جوابت پێ ئەدرێتەوە؟! جوابەکەی تۆیش هەر جوابی ئەوانە و ئەنجامیشت وەکوو ئەنجامی ئەوانە.

نەوەڵڵا کە ئەنجام کوشتنە با هەر خۆم بچم. ئەو دڵەم نییە کە تۆ لە بەرچاومەوە سەر ببڕن. کوڕە وتی: هەر ئەبێ بمنێرێت، یا جواب ئەدەمەوە یان منیش وەکوو ئەو عالەمە. بە هەرجۆر بوو باوکی ڕازی کرد. باوك وتی: باشە بڕۆ.

کوڕە هەستا چوو بۆ بارەگای پادشا. حوشترێك و بزنێکی لەگەڵ خۆی برد. لەبەر بارەگای پادشادا بەستنیەوە و خەبەریان نارد بۆ پادشا کە یەکێك هاتووە بۆ وەڵام دانەوە. پادشا وتی: با بێتە ژوورەوە. کوڕە چووە ژوورەوە.

پادشا منداڵێکی بەرچاو کەوت، وتی: ئەوە کەسێکی لە تۆ گەورەتر نەبوو بێت؟ کوڕە وتی: بەڵێ هەیە. هاتە دەرەوە هەوساری حوشتری گرت و بردیە ژوورەوە. پادشا زۆری بەلاوە سەیر بوو وتی: کوڕم، یەکێك کە ڕیشێکی هەبێت و دنیای دیبێت. کوڕە دیسان هاتە دەرەوە ڕیشی بزنەکەی گرت و بردیە ژوورەوە. کوڕە وتی: پادشاهم ڕیشدارت ئەوێ ئەمە ڕیش؛ چاوت لێیە چ ڕیشێکی هەیە. پادشا ئەوەندەی‌تر لێی بە ڕقا چوو. لە دڵی خۆیا

وتی: ئێستە بۆ بیکوژم، پرسیارەکەی لێ ئەکەم جواب ناداتەوە ئەو وەختە ئەیکوژم. وتی: باشە ڕۆڵە، باشە. کوڕە وتی: پادشام پرسیارت بکە. پادشا وتی: من خوا هێناومی یا خۆم هاتووم؟ کوڕە وتی:

پادشاهم نە خوا هێناوتی نە خۆیشت هاتویت. پادشا وتی: ئەی کێ منی هێناوە؟ کوڕە وتی: کردەوەی ئێمە. ئەگەر ئێمە باش بووینایە تۆش باش ئەبوویت. پادشا وەڵامی کوڕەکەی زۆر بەدڵ بوو. کوڕەی گرت و ماچی کردەوە. ناردی باوکیان هێنا و کردی بە وەزیری خۆی. ئەو زوڵم و ستەمەش کە هەیبوو هەمووی لابرد. عالەم هەموو کەوتنە خۆشییەوە. پاش بەینێك بە کوڕەکەی وت: چاوت لێیە کە چەند چاك بووم؟ کوڕە وتی: پادشاهم ئەوە ئێمە چاك بووین، بۆیە تۆیش چاك بوویت. پادشا ئەوەندەی‌تر قسەکەی پێ‌خۆش بوو.

**٢٤٧.** ئەڵێن: لە وەختی خۆیا لە ئەستەمبوڵ جوولەکەیەك هاتە سەر ئەوەکە موسڵمان ببێ. چوون خەبەریان بە سەدری ئەعزەم دا ("شیخ الإسلام"یش بوو). ئەویش ئەوەی پێویست بوو لە ئاهەنگ و زەماوەند بۆی جێبەجێ کرد و لە کۆبوونەوەیەکی ڕەسمیدا تەڵقینی جوولەکەی دادا و شایەت ئیمانی پێ هێنا و جووە موسڵمان بوو. هەر کە شایەت ئیمانی هێنا سەدری ئەعزەم وتی: بیکوژن. ئەم فەرمانە بوو بە شتێکی سەیر و دەنگی دایەوە. هەرچەندە عالەم کۆششیان کرد، کەڵکی نەبوو. فەرمانی سەدری ئەعزەم گێڕانەوەی نییە.

خەڵکەکە پەنایان بردە بەر سوڵتان کە بەڵکوو ئەو چارێك بکا. چۆن ئەبێ جوولەکەیەك لەبەر ئەوە موسڵمان بووە سەدری ئەعزەم فەرمان بدا بە کوشتنی؟

سوڵتان وتی: فەرمانی شەرعە و شێخولئیسلام داویەتی، من ناتوانم بیگێڕمەوە. خەڵکەکە هەر وازیان نەهێنا؛ چونکە ئیشەکە زۆر نابەجێ بوو؛ جوولەکە موسڵمان ببێت و لەسەر موسڵمانییەتیەکەی بکوژرێ! ئەمە هەر نەبووە. سوڵتانیش لە دڵا بەلایەوە ئیشێکی ناهەموار بوو، بەڵام شێخولئیسلام بە فەرمانی شەرعی فتوای داوە ئەم ناتوانێ لەم ڕووەوە هەڵیوەشێنێتەوە. شێخولئیسلامیش لەسەر قسەی خۆی نەئەهاتە خوارەوە.

لە ئەنجاما شێخولئیسلامی بانگی کرد و وتی: فەرمانی شەرع گێڕانەوەی نییە، بەڵام چ من و چ ئەم خەڵکە ئەمانەوێ لەمە تێبگەین کە چۆن ئەبێ غەیرە دینێك کە موسڵمان ئەبێ لە[...][1]

**٢٤٨.** [ . . .] بکەوێ لە کەوچك دەست بکەن بە جنێوان بە من و بڵێن خوا بتگرێ مامەوڵا بۆ کچێك بەخێوت کردووە. با بۆ خۆی لە ماڵا داکەوێ کەڵکی مێردی نییە. وتیان: مامەوڵا ئەو عەیبە چییە وا تۆ باوکیت دانی پێدا ئەنی؟ هیچ باوك و دایکێك نییە دان بە عەیبی مناڵی خۆیانا بنێن؛ بەتایبەتی کچ کە هەر ئەبێ مێرد بکا و بڕوا.

مامەوڵا وتی: باوکم کچەکەم بێ فیکرە، کەڵکی مێردی نییە، شتی زوو لەبیر ئەچێتەوە. بکەوێتە لای هەرکەس لە پاش چوار ڕۆژ تووشی دیق ئەبێ و ئەیداتەوە بەسەرما. نەوەڵڵا با دۆستایەتی بمێنێ و کەسمان لە کەسمان عاجز نەبین.

هەرچەند ئەوان وتیان: مامەوڵا ئەمە شتێکی وا نییە ئێمە بە هەموو شتێکەوە قەبووڵمانە، مامەوڵا دەستی نەهێنایە پێشەوە. جەماعەت ناچار ڕۆیشتن و وازیان هێنا. کچەش گوێی لە ئەم هەموو حیکایەت و کارەساتە

١. [ئەم داستانە و داستانی پاشەوەی ناتەواوە، پێئەچێ لە کاتی ئامادەکردنیا لاپەڕەیەکی داکەوتبێت ... بڵاوکردنەوەی کوردستان]

بوو، هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا.

کە ئەوان ڕۆیشتن کچە خرتەخرت کەوتە خۆی. کە ئیشێکیان پێ ئەوت وەکوو کێچ ڕائەپەڕی؛ کە باوکی پێ ئەوت ئیش و دەنگی زەنگی کلێسە هەر لە مێشکیا ئەمایەوە، شتێك نەبوو کە دوو جار پێی بوترێ. هەر شتێك کە مامەوڵا یەکەمجار پێی وت هەر ئەوە بوو؛ دووبارەی نەبوو. تەنانەت ئەو ئامۆژگارییانە کە پێش چەند ساڵ باوکی ئەیکرد هەمووی هێنایەوە بیری خۆی و هەرگیز ئیتر ڕێك نەکەوت جارێك ئیشێکی پێ بوترێ و بۆ جاری دووهەم بڵێ: لە بیرم نەبوو. هەتا ماوەیەکی باشی پێچوو؛ مامەوڵا زۆر حەسایەوە و پاشان دای بە مێرد و لە دڵی خۆیا وتی: ئاوا چارت ئەکەم، ئای کچ.!

**٢٤٩.** جاران لەو خوارە داواکردنی پێغەمبەری باوێکی زۆری هەبوو. هەرکەس هەڵئەستا داوای پێغەمبەری ئەکرد.

لە ساڵێ (٣٢٥) هیجری کابرایەك ڕاست بووەوە وتی: من پێغەمبەرم. وتیان: پەرجۆ (موعجیزە)ت چییە؟ وتی: هەرکەسە کچێکی جوان یا خوشك یا ژنێکی هەبێ بۆم بێنێ من خێرا سکی پڕ ئەکەم، هەر ئەو کاتە کوڕێکی جوانی ئەبێ لە باوکی کچە یا مێردی ژنە یا برای خوشکەکە ئەکا. کە ئیش ئەگەیشتە ئێرە زۆر کەس ئەیانوت ئەشەنوبیللا تۆ پێغەمبەریت.

جارێك گرتیان و بردیانە لای پادشا. هەر چەشنی قسەی ئەکرد. پیاوێك ڕاست بووەوە وتی: یا پێغەمبەری خوا! من نە کچم هەیە، نە ژنم هەیە و نە خوشك. بزنێکم هەیە بۆت دێنم ئاوسی کە. پێغەمبەر هەر هەستا ڕاست بووەوە و ویستی بڕوا. وتیان: بۆ کوێ ئەچی؟ وتی: ئەچم بۆلای جبرەئیل پێی ئەڵێم: ئەمانە «تەگە»یان ئەوێ؛ ئیشێکیان بە پێغەمبەر

نییە. دەستیان کرد بە پێکەنین و بەرەڵایان کرد.

٢٥٠. ئەگێڕنەوە: حەکیمێك کوڕێکی هەبوو ئەیویست فێری حەکیمی بکا؛ ئەیوت: ڕۆڵە! کە چوویتە سەر نەخۆشێك لە پێشا لە حەوشەکەدا کە چوویتە ژوورەوە چاوێك بگێڕە بزانە چی کەوتووە؛ بڵێ: لەوەی خواردووە بۆیە نەخۆش کەوتووە؛ بزانە: ئەگەر توێکڵە هێلکە کەوتبوو، بڵێ: ئەمە هێلکەی خواردووە و سکی توند کردووە! ئەگەر پەڕی مریشك کەوتبوو، بڵێ: ئەمە گۆشتی مریشکی شەومەنەی خواردووە بۆیە نەخۆش کەوتووە! ئەگەر ماست و دۆ و شتە ڕژابوو، بڵێ: ئەمە ماستی خواردووە و ساردی کردووە! هەروا بەو جۆرە هەموو شت.

کوڕە بەپێی ئامۆژگارییەکەی باوکی ئەچوو بەڕێوە و لەسەر هەر نەخۆشێك شتێکی بۆ ئەدۆزییەوە و ئەیکرد بە مەهانەی نەخۆشییەکەی. ڕۆژێ چووە سەر نەخۆشێك، هەرچەند چاوی گێڕا لە حەوشەی دەوروبەریا، هیچی بەرچاو نەکەوت بیکا بە مەهانە، تەنیا ئەوی لەو ناوا داکەوتبوو کورتانە کەرێك بوو. چووە ژوورەوە هەندێ سەیری نەخۆشەکەی کرد و وتی: ئەمە بۆیە نەخۆش کەوتووە، گۆشتی کەری زۆر خواردووە! خەڵکەکە ئەم شتەیان بەلاوە زۆر سەیر بوو، ئەتوانم بڵێم: هەیترەیان لێ کرد و بە سەروگوێلاك شکاوی گێڕایانەوە دواوە.

کە هاتەوە باوکی چاوی بەو کارەساتە کەوت، وتی: ئەمە چییە؟ وتی: بابە لەسەر ئامۆژگارییەکەی تۆ، کە چووم چاوم گێڕا هیچم بەرچاو نەکەوت؛ کورتانە کەرێك لە حەوشەکەدا بوو، وتم: ئەم نەخۆشە گۆشتی کەری خواردووە، وا وایان لێ کردم! باوکی وتی: خوا بتگرێ ڕۆڵە بۆ خۆت و بۆ ئەقڵت، من کە ئامۆژگاریم کردی، ئاوام کردی؟!.

٢٥١. هەر ئەم حەکیمە و هەر ئەو کوڕە: جارێك کە ئامۆژگاری کوڕەکەی کرد وتی: ڕۆڵە! کە چوویتە سەر نەخۆش، ئەگەر هیچت بۆ درنەکەوت بیکەی بە نیشانەی نەخۆشییەکەی و فیکریشت بۆ ئەوە نەچوو کە دەرمانێکی بۆ بنووێنی، بڵێ: ئاوی بدەنێ، ئاو لە هەموو شت بێمزەڕەتترە، کە هاتیەوە چۆنیەتی نەخۆشەکەم بۆ باس بکە من دەرمانەکەیت پێ ئەڵێم.

ڕۆژێك هاتن بەشوێنیا و چووە سەر نەخۆشێك، هەرچەند چاوی گێڕا شتێکی بەرچاو نەکەوت بیکا بە مەهانەی نەخۆشییەکەی. دنیاش سارد نەبوو، تا بڵێی سەرمای بووە و نەخۆش کەوتووە؛ وتی: ئەمە سکی وەستاوە، ئاوی بدەنێ. ئەوەندەیان ئاو کرد بە گەروویا تا جێگە نەما و ئاوەکە لە دەمیە ئەهاتەوە دەرەوە! ئەویش هەر ئەیوت: ئاوی بدەنێ.

وتیان: جێگا نەماوە، وتی: دەستووری کەن بە ئاو! ئاوی بدەنێ؛ ئەوانیش دەستیان کرد بە حوقنە کردنی! ئەمیش هەر ئەیوت: ئاوی بدەنێ. ئەوەندەیان ئاو لە سەر و خوارەوە کردە ناو سکی نەخۆشەوە، سکی نەخۆش وەکوو هیزەی فوو دراوی لێ هات، شەقەیەك هات و لێك بووەوە! کابرا ڕاچەنی و وتی: ئەوە چی بوو؟ وتیان: نەخۆشەکە بوو شەقی برد! وتی: بەداخەوە. لەوێش بە تێهەڵدان دەریان کرد. هاتەوە بۆلای باوکی، کارەساتەکەی گێڕایەوە. باوکی وتی: خوا بتگرێ ڕۆڵە بۆ ئەقڵت!

ئیتر لەو ڕۆژەشەوە کوڕەیان ناو نایە: «حەکیم قوونایی» و ئەو ناوەی بڕا بەسەرا. باوکیشی تۆبەی کرد، ئیتر نە ئامۆژگاری کرد، وە نە ناردیشی بۆ سەر نەخۆش؛ وتی: «داری ژاڵە بێبەرە»!.

٢٥٢. سەردەمی پێشوو هێشتا ئەم هەتیو هووتە دانەهاتبوو بۆ دوختۆری و حەکیمی، واتە ئەم شتومەکە زۆرە کە دوکتۆر بەهۆی ئەوانەوە

نەخۆشی نەخۆشی، بۆ دەرئەکەوێ، وە ئەبێ لە نەخۆشەکەش بپرسێ: کە چیتە. گوایە ئەمە بۆ ئەوە کلیلێك بێ بۆ دەرکەوتنی نەخۆشییەکە. ئەگەر یەکێکیش بڵێ: بابە ئەم پرس و خواسەی بۆچییە، دوختۆر ئەبێ خۆی نەخۆشی بزانێ و بناسێ. ئەگەر یەکێ ئەم قسەیە کرد، ئەیکەن بە کێوا. ئەڵێن: ئەی دوختۆر لە نەخۆش نەپرسێ؟ ئەمە چ قسەیەکە تۆ ئەیکەی.

بابە با وابێ. بۆ پشتیوانی قسەکەی تۆ جاران حەکیمەکان دوو شتیان هەبوو بۆ ناسینی نەخۆش. یەکێ ئەهات نەبزی دەستی ئەگرت، یەکێ ئەیوت: زمانت دەرکە بزانم باری زمانت چۆنە؟ لەم دوو ڕێگاوە حەکیم بۆی دەرئەکەوت کە نەخۆشی ئەو نەخۆشە چییە و دەرمانی بۆ دەستنیشان ئەکرد. ئەمە بیرو ڕای حەکیمەکانی پێشوو بوو.

ئەڵێ: حەکیمێك هەرجارە کە ئەچووە سەر نەخۆش، هەر کە «نَبض»ی ئەگرت نەخۆشییەکەی بۆ دەرئەکەوت، دەرمانی بۆ دەستنیشان ئەکرد و چاك ئەبووەوە. زۆر کەس بڕوایان بەمە نەئەکرد. دوژمنەکانی ئەم ناوەیان بۆ بڵاوکردەوە و گەیاندیانە لای پادشا کە ئەمە درۆیە. پادشا وتی: ئەبێ تاقی بکەینەوە، ئەگەر درۆ بوو لە سەری ئەدەین.

پیاوی ناردە لای حەکیم کە کچی پادشا نەخۆشە و ئەبێ بێت بۆ چاوپێکەوتنی. ئەویش هات وتی: بیهێنن با چاوم پێ بکەوێ و نەبزی بگرم. وتیان: کچی پادشا هەتاو سیبەری سەری نەبینیوە، ئێستە چۆن ئەبێ تۆ دەستی بگری و نەبزی بگری؟ وتی: باشە لە ژوورێکی تر داینێن، دەزوویێك ببەستن بە دەستیەوە من لەم دیوەوە سەری دەزووەکە ئەگرم، بەو جۆرەش ئەتوانم نەخۆشییەکەیم بۆ دەرکەوێ. وتیان: باشە.

ئەمجا چوون پشیلەیەکی نەخۆشیان هێنا لە ژوورێکا دایاننا، دەزوویێکیان

بەست بە دەستیەوە، سەری دەزووەکەیان هێنایە ژوورەکەی‌تر پادشا و پیاوماقووڵان هەموو لەوێ بوون. حەکیمەکەش دانیشتبوو، ئاگای لە هیچ نییە. سەری دەزووەکەیان دا بە دەستیەوە. حەکیم دەزووی گرت تۆزێ واقی وڕ ما، دەزووی بەرەڵا کرد و دیسان گرتیەوە. دوو سێ جار ئەمەی کرد و هەر زۆرتر سەری سڕ ئەما و دەنگیشی نەئەکرد. پاشان لێیان پرسی: چییە بۆچ دەنگ ناکەی؟ وتی: نازانم بڵێم چی، منیش زۆر سەرم سوڕ ماوە. ئەم نەخۆشە دەرمانەکەی گۆشتی مشکە. لەوە زیاترم بۆ دەرناکەوێ. پادشا و پیاوماقووڵان هەموو ئافەرینیان کرد و وتیان: ڕاستە، تۆ حەکیمیت. پادشا ویستی تۆ تاقی بکاتەوە، ئەوەی کە دەزووەکەی بەستراوە بە دەستەوە پشیلەیە و عینسان نییە!.





عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەلەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری داب‌ونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەججادی.

ناوی «عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سەججادی»یە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ١٩٣٨ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە خاتوون» بووە بە پێش‌نوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «نەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزڵجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ١٩٣٩ی زایینیدا چۆتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی و لە ١٩٤١دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ١٩٤٩دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ١٩٤٨دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ١٩٧٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ١٩٧٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممەی ١٩٨٤/١٢/١٤ی زایینی، کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەججادی زیاتر لە چل ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

**ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت**



انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج- پاساژ عزتی- تلفن: ۳۳۱۶۵۳۸۲




